٤

زنجیره داستانی پێغەمبەران

# ژیانی عیسا

عليه السلام





نووسینی

هێمن بهاء الدين قەرەداغی

دانا عثمان حسن

٤

زنجیره داستانی پێغەمبەران

# ژیانی عیسا

علیه السلام

نووسینی

هێمن بهاء الدین قەرەداغی

دانا عثمان حسن

١٤١٩ك چاپی یەکەم ١٩٩٩ز

بسم الله الرحمن الرحيم

| ناوی سورەت | ژمارەی ئایەت |
|---|---|
| البقرة | ٨٧ ، ١٣٦ ، ٢٥٣ |
| آل عمران | ٤٥ ، ٥٢ ، ٥٥ ، ٥٩ ، ٨٤ |
| النساء | ١٥٧ ، ١٦٣ ، ١٧١ ، ١٧٢ |
| المائدة | ١٧ ، ٤٦ ، ٧٢ ، ٧٥ ، ٧٨ ، ١١٠ ، ١١٢ ، ١١٤ ، ١١٦ |
| الأنعام | ٨٥ |
| التوبة | ٣٠ ، ٣١ |
| مريم | ٣٤ |
| المؤمنون | ٥٠ |
| الأحزاب | ٧ |
| الشورى | ١٣ |
| الزخرف | ٥٧ ، ٦٣ |
| الحديد | ٢٧ |
| الصف | ٦ ، ١٤ |


ناوی کتێب: ژیانی عیسا ([illegible])

نووسەران : هێمن بهاء الدين قەرەداغی _ دانا عثمان حسن

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن : (٧٣) لەلایەن وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله ، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور انفسنا وسيئات أعمالنا ، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له ، وأشهد أن لاإله إلا الله وحده لاشريك له ، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

زنجیرەیەكی ترو باخێكی‌تر لە گوڵزاری ژیانی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) لە خۆشحاڵیەوە هاتەوە بەر دیدی ئێوەی خوێنەرانی تامەزۆری دیداری پێغەمبەران‌و شوێنكەوتەی ڕێبازە پڕ بەرکەت‌و حیكمەتەكانیان.

زنجیرەی چوارەم بەشێكی ترە لەو كاروانە دوورو درێژەی كە كاروان چیانی هەنگاوەكانیان ڕووەو ئاوەدان كردنەوەی ژیانی هەتا هەتایی دەنێن ، باسێكی ترە لە باسی هەڵگرانی پەیامی یەكتاپەرستی‌و سەرفرازی ، ئەزموونێكی ترە لە ئەزموونەكانی بانگخوازی‌و ماندوو نەناسی ، داستانێكە هەرچەندە تەماشاكەران‌و خوێنەرانی لێی ورد ببنەوە هەنگاوی زیاتریان ناوە ڕووەو ئاشانا بوون بەسەر فرازان.

ژیانی عیسا (عليه السلام) جیاوازە لە ناو هەموو ژیانەكانی تردا ، داستانێكە زۆرێكی بێ ئەنداز بەسەرهاتی موعجزە دارو ئەزموون داری لە خۆ گرتووە ، بەرامبەر ئەم هەموو ڕووداو و بەسەر هاتانە بەشێكی زۆری بێ ئەندازیش زیادەو زیادەڕەوی تێدا كراوەو شێوێنراوەو وەك خۆی نەهێڵراوە ، بەشێوەیەك ئەگەر تەرازووی یەكسان‌و بێ هەڵەی ئیسلامی پێ نەبێت زۆر مەحاڵە ئەم لێك ئاڵاوی‌و شێواویە لێك جیا بكاتەوە.

دەستکاری کردن و شێواندنەکان بەپێی سەردەمەکان بەردەوام بوون ، بە تایبەتی لەو پەرتووکە ئاسمانیەدا کە پەروەردگار پێشکەشی عیسای (عليه السلام) کردووە ، بە شێوەك چەند جۆرێك لەم پەرتووکە هەیەو لەیەك دانەیی دەرچووە ، شتانێکی وە هایان تێ ئاخنراوەو کراوەتە دەقی (ئینجیل) کە بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ زاتی بێ گەردی پەروەردگاردا ناگونجێو ، خودی عیسا پێغەمبەریش (عليه السلام) لێی بێ بەری بێت.

ئەوەندەی خوای گەورە یارمەتی دابێت لەم زنجیرەیەدا هەستاوین بە بەساکردنی یەك لەدوای یەکی ڕووداوەکانی ژیانی ئەم پێغەمبەرە شیرینەو ، هەموو بە بەڵگەی ڕاست و دروستی قورئان و سوننەت لێی دواوین ، پاشان بڕێکی باشی بێ ئەنداز هەستاوین بەدەرخستن و ئاشکرا کردنی ئەو دەست کاری و شێواویانەی کە لەم داستانەدا کراوە لە لایەن خودی مەسیحیەکانەوەو هەموو کەم کورتی یەکانمان بە بەڵگەی قورئان و سوننەت باس لێوە کردووە.

ئەوەی باش و ڕاست و پێکراو بێت ئەوە لەلایەن خوای بێ گەردەوە بووەو ئەوەشی هەڵەو نەزانی بووبێت لە کەم و کورتی خۆمانەوە ، بەهیوای ئەوەی ببێتە توویشوی نەبڕاوە بۆ ڕۆژی نەبڕاوەو کۆتا نەهاتو..... آمین



**نووسەران**

دانا عثمان حسن

هێمن بهاوالدین قەرەداغی

سلێمانی

١ / ١١ / ١٩٩٨

## زانیاریەك دەربارەی عیسای کوڕی مەریەم (عليه السلام)

عیسای کوڕی مەریەم بریتی‌یە لە کۆتا پێغەمبەری گەلی بەنو ئیسرائیل —جولەکە- لەقەبی ئەم پێغەمبەرە بەرزە بریتی‌یە لە (المسیح)، پاشان بە زمانی جولەکە (العبرانیە) پی‌ی دەڵێن (یشوع) کە بە مانای دڵسۆزی (المخلص) دێت.

هەروەها لە (ئینجیل) دا بە (یسوع) ناوی هاتووەو ناودەبرێت.

عیسای کوڕی مەریەم یەکێکە لە بەندە هەڵبژێردراوەکانی خوای گەورە بۆ کاری پێغەمبەرایەتی، هەروەها یەکێکە لەو بەندە نرخ دارو بەرێزانەی کە بەبێ باوك خوای گەورە بەدەسەڵاتی خۆی هێنایە سەر شانۆی ژیان.

عیسا (علیه السلام) یەکێکە لەو کەسانەی کە لەگەڵ لەدایك بوونیدا بەفەرمان‌و ویستی خوای گەورە زمانی پاراو دەستی کرد بە قسەکردن‌و دواندن لەگەڵ دایکی داوێن پاکیدا.

## نەسەبی عیساو باس کردنی لە ئینجیل ی دەست کاری کراودا

گاورە خاچ پەرستەکان باوەڕیان وەهایە کە عیسا بەبێ باوك لەدایك نەبووە بەڵکو مەریەمی دایکی شوی کردووە بە پیاوێك بە ناوی (یوسف النجار) ەوە کە هەریەك لە ئینجیلی (لوقا، متی، یوحنا، مرقص) ئاماژە بۆ ئەم باسە دەکەن!!

بەڵام ئەمەی گاورە خاچ پەرستەکان باوەڕیان پی‌ی هەیەو لە (ئینجیل) ە کەیاندا باسی لێوەکراوە زۆر لە ڕاستی مەسەلەکانەوە دوورەو دژایەتی ڕاستەوخۆی هەیە لەگەڵ ئایەتەکانی قورئاندا، چونکە قورئان کاتێ باسی ئەم ڕووداوەمان بۆ دەکات ئاماژە بۆ ئە ڕاستیە دەکات کە مەریەم بە کچێتی عیسای لێبووەو پاشان باسی هیچ مەسەلەیەك ناکات کە مەریەم شوی کردبێ.

کەواتە ڕاست ئەوەیە کە بڵێین مەریەم بەبێ مێرد عیسای بوو بەفەرمان ی خوای گەورە، وە ئەوەی گاورەکان دەیڵێن‌و باوەڕیان پی‌یەتی شتێکی بێ ناوەڕۆکەو بناغەیەکی واقعی‌و زانستی نیە و دورە لە ڕاستی مەسەلەکانەوە.

## چەند ڕێساو بنەمایەك لەم نوسراوەدا

ژیانی عیسا یەكێكە لە ژیانی ئەو پێغەمبەرانەی كە زۆرترین نوسراو لە دەربارەیەوە باسكراوە بە تایبەتی لە (ئینجیل) ە دەست كاریكراوەكانداو هەریەكەی بەجۆرێك.

**ئێمەش وەك نوسەرێكی ژیانی ئەم پێغەمبەرە بەرزە هەڵساین لە نوسینەوەی ژیانی عیسا (عليه السلام) بەم جۆرەی خوارەوە:**

١- باس كردنی ژیانی عیسای كوڕی مەریەم بەبەڵگەی قورئانو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) كە ئەمە بناغەی سەرجەم باسەكانە.

٢- فڕێ دانو پشت گوێ خستنی ئەو باسانەی كە لە (ئینجیل) ە دەست نوسەكانادا باسیان لێوە كراوەو تەنها یەك باسمان لە (ئینجیل) ە كان نەكردۆتە بەڵگە لەسەر ڕاستی باسەكان، چونكە باوەڕمان وەهایە كە (ئینجیل) دەست كاری كراوەو ڕاست نیە.

٣- بۆ مەبەستی تەفسیر كردنی ئایەتەكان چەندین تەفسیری بەهێزمان هێناوە لەگەڵ قسەی زانایان ی شارەزا لەو بوارەدا كە لە پەراوێزەكاندا ئاماژەیان بۆ كراوە.

٤- ئەو فەرموودانەی كە بەبەڵگە هێنراونەتەوە سەرجەم فەرموودەی ڕاستنو دوور لە لاوازیو گومان لە ڕاستێتیدا، واتە (صحیح)ن و پاشان پلەی فەرموودەكەشمان دیاری كردووە.

# بەندی یەکەم

## سەرەتایەك دەربارەی عیساو گەلەکەی

***زۆر پێویستە کە لەسەرەتادا چەند کەسایەتیەك هەیە بیان ناسین و کورتە پێناسەیەك لە دەربارەی ژیانیانەوە بنوسین تا خوێنەری بەرێز زیاتر ئاگادارو شارەزای ئەم چیرۆکەو بەسەرهاتە بێت و باس و ڕووداوەکانی لاشاراوەو نادیار نەبێت کە ئەوانیش بریتین لە:***

١- (عمران): یەکێك بوو لەو پیاوە بەرێزانەی کە لە ناو گەلی بەنی ئیسرائیلدا بوو، (عمران) کەسایەتیەکی زۆر خواناس و یەکتاپەرست بوو، (عمران) خێزانێکی هەبوو (نەزۆك) بووو مندالّی نەدەبوو، کاتەکانی ژیان ڕۆیی بەسەریانداو خێزانەکەی بەساڵدا چووو بەرەو ڕوی پیری ڕۆی دەنا ئالەم کاتەدا خێزانەکەی (عمران) بە دڵێکی زۆر پڕ لە ئومێدەوە دەستی پاڕانەوەی بەرز کردەوە بۆلای پەروەردگاری و فەرمووی:

﴿ئەی پەروەردگارم وە چەیەکم پێ ببەخشەوە پەیمان بێت ئەگەر ئەو وەچەیەم کوڕ بوو ئەوە دەبێت بیکەمە خزمەتکاری (بیت المقدس)﴾، کە (بیت المقدس) وەك ماڵ و خانەی خوای گەورە دروشمی پەرستنیان تێدا بەرز دەکردەوەو مل کەچی خۆیان بۆ خوای گەورە تێدا دەردەبڕی.

بەڵێ خوای گەورە ئاگاداری نیەتی پاك و دڵ پڕ لە هیوای خێزانەکەی (عمران) و داواکاریەکەی جێبەجێ کردوو (خێزانەکەی) عمران پاش ماوەیەك مندالّێکی چاو گەشی پێ بەخشرا لە لایەن خوای گەورەوە بەڵام قەدەری پەروەردگار وە ها بوو کە ئەو منداڵە کوڕنەبێت و (کچ) بێت، لەم کاتەدا (عمران) و خێزانەکەی زۆر سوپاسی پەروەرگاریان کردوو ناویان نا (مریم).

٢- (مریم): بریتی بوو لە و ئافرەتە داوێن پاکەی کە لە خانەوادەیەکی پاکی وەك (عمران) هوە پەیدا بووو سەرجەم ژیانی لە خوا پەرستی و کەنار نشینیدا دەبردە سەر (کە انشاءالله) لە پاشانداو لە باسەکانی تردا بە درێژی باسیان لێوە دەکەین.

٣- گەلی بەنی ئیسرائیل: بێگومان (عیسا) (عليه السلام) دواین پێغەمبەر بوو بۆ گەلی بەنی ئیسرائیل، کەواتە زۆر پێویستە کەوا بزانین گەلی بەنی ئیسرائیل چین و کێن:

ووشەی (اسرائیل) لەقەبێکە بۆ (یەعقوب) پێغەمبەر (عليه السلام) کە (یەعقوب) باوکی (یوسف) پێغەمبەرە )علیهم السلام)، لە پاش جێگیر بوونی (یوسف) و (یعقوب) و براکانی لە وولاتی (مصر) دا گەلی بەنی اسرائیل بەسەر زەویدا بڵاو بوونەوەو زۆر بوون[1]، هەروەها ووشەی (بەنی) لە زمانی (عەرەبی)دا بۆ(نەوە) بەکار دەهێنرێت، واتە کاتێ دەڵێیت (بەنی اسرائیل) واتە نەوەکانی (اسرائیل) بەو مانایەی (نەوەکانی ـ یعقوب پێغەمبەر دەکات).

گەلی بەنی ئیسرائیل بەهۆی ئەوەی گەلێکی بەدکارو خراپەکار بوون خوای گەورە زۆر ترین رێژەی پێغەمبەری بۆ ناردن و دوایین پێغەمبەریان بریتی بوو لە (عیسا) ی کوڕی (مەریەم) (عليه السلام) کە هەروەك پێغەمبەرانی پێش خۆی لەلایەن ئەم گەلە بەدکارەوە بەدرۆ خرایەوەو پیلان دژی دارێژرا بۆ مەبەستی کوشتن و لەناو بردنی بەڵام خوای گەورە بەهێزو دەستەڵاتی فراوانە و بێ وێنەی خۆی (عیسا) ی لە دەستی چەپەڵ و خیانەتکاری ئەم گەلە بەدکارە رزگار کردوو بردیەوە بۆ ئاسمان.

## لەدایك بوونی مریم (عليها السلام)

هەروەك لەسەرەتادا باسمان کرد خێزانەکەی (عمران) داوای کرد لە خوای گەورە کە کوڕێکی پێببەخشێ و لەپاشاندا بیکاتە خزمەتکاری (بیت المقدس)، خوای گەورە وەڵامی داواکاریەکەی خێزانی (عمران) ی دایەوە و لەبری کوڕێك کچێکی بەخشی بە (عمران)و خێزانەکەی ئەوانیش لەپاشاندا ناویان نا (مریم) خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرمێت:

﴿إذ قالت امرأة عمران رب اني نذرت لك هافي بطني محرراً فتقبل مني انك أنت السميع العيم * فلما وضعتها قالت رب اني وضعتها أنثى والله أعلم بما وضعت وليس الذكر كا لأنثى واني سميتها مريم﴾ (آل عمران:٣٥-٣٦).

واتە: کاتێ کە خێزانەکەی(عمران) ووتی: ئەی پەروەردگارم: من واجبم کردوە لەسەر خۆم کە ئەگەر ئەوەی لە ناو سکمدایە کوڕ بوو ئەوە بیکەمە خزمەت کاری خانەی تۆ (بیت المقدس) ، ئەی پەروەردگارم ئەم داواکاریەم جێبەجێ بکە، چونکە بەڕاستی تۆ

(١) سەیری نامیلکەی(جولەکەکان) بکە بۆ مەبەستی زیاتر شارەزا بوونت.

زاناو بیستەری حاڵی بەندەکانیت لەپاش ئەوەی کە خێزانەکەی (عمران) سکەکەی داناو وتی ((ئەی پەروەردگارم ئەو منداڵەی کە بوومە لە توخمی (مێ) یە بەڵام خوای گەورە زاناتر بوو لەو بەوەی کە خێزانەکەی (عمران) چی بووە، هەروەها نێرینە هەرگیز وەك مێینە نیە، لەپاشاندا خێزانەکەی (عمران) دەفەرمووێ: ئەوە من ناوم نا (مريم).

بەڵێ لە پاش ئەوەی کە خێزانەکەی (عمران) (مريم)ی بوو دەست بە جێ داوای کرد لە خوای گەورە کە (مريم) و نەوەکانی دوای ئەویش بپارێزێ لە شەیتانی نەفرین لێکراو هەروەك دەفەرمووێ:

(وإني أعيذها بك وذريتها من الشيطان الرجيم) (ال عمران:٣٦).

واتە: ئەی پەروەردگارم من بۆ (مريم) و نەوەکانی دوای ئەویش پەنا بەتۆ دەگرم لە شەیتانی دەرکراوو نەفریت لێکراو.

لەپاشاندا خوای گەورە دەست بە جێ وەڵامی داواکاریەکەی خێزانەدارێن پاك و بە ئیمانەکەی (عمران) دەداتەوەو دەفەرمێت: ﴿فتقبلها ربها بقبول حسن وأنبتها نباتا حسنا﴾ (ال عمران:٣٦).

واتە: پەروەردگاری (مەریەم) مەریەمی لەدایکی وەرگرت بەوەرگرتنێکی جوان وە رازی بوو بەوە کە مەریەم ببێتە خزمەت کاری خانەی خوای گەورەو وە ڕواندی بە ڕواندنێکی جوان و چاك ــ بەو مانایەی کە خوای گەورە مەریەمی پەروەردەکرد بە پەروەردەکردنێکی جوان چ لە ڕووی جەستەو لاشەوە چ لە ڕووی ڕەوشت و سەرجەم لایەنە مەعنەوی و ڕۆحیەکانی ترەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەمێت: ((كل بني ادم يطعن الشيطان في جنبه تلده أمه الا عيسى ابن مريم ذهب يطعن فطعن بالحجاب)).[2]

بەڵێ پاش ماوەیەك بەسەر لەدایك بوونی (مەریەم) دا باوکی کۆچی دوایی کردوو (مەریەم) بەبێ باوك مایەوە، لەم کاتەدا کەسێك ی خواناس و باوەڕداری وەك (زەکەریا) هەڵسا بەوەی کە جێگەی (عمران) ی باوکی مەریەم بگرێتەوەو مەریەم لەلای خۆی دابنێ و مەسئولیەتی بەخێوکردن و پەروەردەکردنی بەباشترین شێوە بخاتە سەر شانی خۆی، بەڵێ پاش ئەوەی مەریەم گەورە بوو (زەکەریا) ژوورێکی تایبەت کرد بەوو بەخشی بە (مريم) بۆ مەبەستی عیبادەت کردن و پەرستنی خوای گەورە تێیدا تا لەم

---

(٢) رواه مسلم وتفسير ابن كثير ج/١ (ص: ٣٦٨).

کاتەدا کە (مریم) بەشەوو بە ڕۆژ دڵی بەرزو پاکی لەگەڵ پەروەردگاریدا گرێ دابوو بەردەوام پاکی‌و بەرزی بۆ خوای خۆی دەردەبڕی زەکەریا دەهاتە ژوورەوەو دیمەنێکی زۆر نەگونجاوو سەر سوڕهێنەری دەبینی کە ئەویش بریتی بوو لەوەی کاتێ دەهاتە ژوورەوەو خواردنی بۆ (مریم) دەهێنا دەی بینی کەوا چەند خواردن‌و میوەهاتێکی وەها لەو ژوورەدایە کە بەرهەمی ئەو وەرزەنین‌و لەبازاڕدا دەست ناکەون؟!

هەر بۆئەم مەبەستە بوو کە (زەکەریا) زۆر بە سەرسوڕمانەوە پرسیاری لە (مەریەم)ی داوێن پاکو خوا پەرست دەکردوو پێ‌ی دەووت:

﴿ ئەی‌مەریەم ئەم خواردن‌و میوەهاتەت لە کوێوە بۆ هاتووەو چۆن بەردەستت کەوتووە؟! مەریەمیش لە وەڵامدا دەی فەرموو، ئەمە لەلایەن پەروەردگارمەوە بۆم دێت‌و ڕزقی ئەو خوایەیە کە ڕزقی بەندەکانی دەدات گەر ئارەزووی لێبێت!!﴾.

قورئان دەفەرمێت:

﴿وكلفها زكريا كلما دخل عليها زكريا المحراب وجد عندها رزقاً قال يا مريم أنى لك هذا؟! قالت هو من عند الله ان الله يرزق من يشاء بغير حساب﴾ (ال عمران:٣٧).

واتە: (زەکەریا) هەڵسا بەبەخێوکردن‌و پەروەردەکردنی مەریەم، لەم کاتەدا .. هەرکاتێ (زەکەریا) بچوایەتە ناو ئەو شوێنەی کە (مریم) عیبادەتی تێدا دەکرد ئەوە ڕۆزی خوای گەورەی دەبینی!! لەم کاتەدا پرسیاری دەکرد لە مەیەرم‌و پێ‌ی دەووت: ئەی مەریەم ئەم ڕزقەت لە کوێ بوو؟!

مەرەیم لەوەڵامدا دەی فەرموو: ئەمە –واتە ئەم ڕزقە– لەلایەن خوای گەورەی خۆمەوەیە، بەڕاستی پەروەردگارم گەر وویستی لێبێت ڕزقی بەندەکانی دەدات بەبێ‌حساب کردن لەگەڵیاندا.

مجاهدو عەکرەمەو سعدی کوڕی جبیرو قەتادەو هەندێکی تر لەو زانا بەڕێزانە لە تەفسیری: ﴿كلما دخل عليها زكريا المحراب وجد عندها رزقا﴾ دەفەرموون: (يعني وجد عندها فاكهة الصيف في الشتاء وفاكهة الشتاء في الصيف).(٣)

واتە کاتێ زەکرەیا دەچووە ژوورەوە بۆ لای مریم میوەی هاوینی دەبینی گەر زستان بوایەو میوەی زستانەی دەبینی گەر هاوین بوایە.

(٣) تفسير ابن كثير ج/١ (ص: ٣٦٨) دار المعرفة ١٩٩٦.

## فریشتەکان مژە دەدەن بە (مریم) (الملائكة تحمل البشرى لمريم)

پاش گەورە بوونی (مەریەم)و بەردەوام بوونی لەسەر خوا پەرستیو عیبادەت کردن هەندێك لە فریشتە بەرزەکانی خوای گەورە بە فەرمانی پەروەردگاریان هاتنە لای (مەریەم) و چەند مژدەیەکی زۆر خۆشیان دایە کە پێیان فەرموو:

﴿يا مريم ان الله اصطفاك وطهرك واصطفاك على نساء العالمين﴾ (ال عمران:٤٢).

واتە: ئەی مەریەم پەروەردگار تۆی بەهۆی پاکیو ڕەفتار بەرزیتەوە هەڵبژاردووەو پاشان پاکژی کردیتەوەو پاشان هەڵی بژاردیو فەضلی تۆی دا بەسەر ئافرەتانی جیهاندا!!!

پێغەمبەر دەفەمێت:

((خير نساء العالمين لربع: مريم بنت عمران، وآسية امرأة فرعون، وخديجة بنت خويلد، وفاطمة بنت محمد))[٤].

واتە: چاکترینو باشترین ئافرەتی جیهان چوار دانەن کە بریتین لە:

١- *مەریەمی کچی عمران.*
٢- *(ئاسیەی) ی ژنی فرعەون.*
٣- *خەدیجەی کچی خوەیلد.*
٤- *فاطمەی کچی (محمد) (ﷺ).*

## ئامۆژگاری فریشتەکان بۆ (مەریەم)

پاش ئەوەی فریشتەکان مژەی داوێن پاکیو بەرزیو هەڵبژاردەی (مەریەم) یان ڕاگەیاند لەگەڵ ئەوەشدا سێ ئامۆژگاری سەرەکیان کرد کە پێکهاتبوون لەوەی کە پێیان ووت:

﴿يا مريم اقنتي لربك واسجدي واركعي مع الراكعين﴾ (ال عمران:٤٣).

واتە: ئەی (مەریەم) گوێ ڕایەڵی پەروەردگارت بکەو لێی بترسەو پاشان کڕنوشی بەندایەتی بۆ خوای خۆت بەرەو ڕکوع ببە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە ڕکوع بۆ پەروەردگاریان دەبەن.

---

(٤) رواه الحاكم باسناد صحيح (سلسلة الأحاديث الصحيحة).

## گفتو گۆی نێوان (جبرئیل)و (مەریەم) (عليها السلام)

مەریەمی بۆ خوا سوڵحاوو داوێن پاك بەردەوام لە ركوعو كڕنوش بردندا بوو بۆ پەروەردگاریو هەمووكات لە یەكێ لە گۆشەو كەنارەكانداو دوور لە خەڵكیو كەسو كاری عیبادەتی خوای گەورەی دەكردو زۆر بە خۆش حاڵانە كاتەكانی ژیانی ڕۆژانەو شەوانەی بۆ خۆی بەسەر دەبردوو خوای گەورەش لەبەرامبەر ئەم دڵە پاكو بێ تاوانەدا بەردەوام ڕزقو ڕەحمەتی خۆی دەنارد بۆیو تەواوی نعمەتەكانی خۆی ڕشتبوو بەسەریدا.

بەڵێ (مەریەم) (عليها السلام) ڕۆژ لەدوای ڕۆژ كاتەكانی ژیانی خۆی بە عیبادەت كردن بەسەر دەبرد بەڵام لەناكاوداو لەو جێگاو شوێنە چۆڵەدا كە عیبادەتی تێدا دەكرد دیمەنێكی زۆر سەیرو ترسناكو كتوو پڕی بینیو كارێكی زۆر سەرسوڕهێنەری تووش بوو كە هەرگیز چاوەڕێی نەدەكرد ئەویش بریتی بوو لەوەی كە لە گەرمەی عیبادەتو پاڕانەوەدا بوو لە پڕو بەخێرایی پیاوێكی كامڵو پیاوانە هاتە ئەو جێگەیەو مریم بەم كارە زۆر پەشۆكاو دەست بەجێ دەمو لێوە پیرۆزەكانی بەناوی پەروەرگار كرایەوەو بەو پیاوەی فەرموو:

﴿من پەنا دەگرم بە خوای گەورە لە تۆ ئەگەر تۆ لە خوا ترسیو خۆت لە تاوان دەپارێزی﴾.

لەم كاتەدا ئەو پیاوە ڕاستێتی ڕووی خۆی بۆ (مەریەم) دەرخستو پیی فەرموو:

((مەترسە من كەسێكی تاوان بارو خراپەكار نیم كە نیەتیخراپەو كاری ناپەسەندم هەبێت لەگەڵ تۆدا بەڵكو من نێردراوم لەلایەن خوای گەورەوە بۆ لای تۆ بۆئەی مەبەستەی كە ببمە هۆكارێك بۆ پیبەخشینی منداڵێكی پاكو جوانو بیتاوان بە تۆ لەلایەن خوای گەورەوە؟!!

لەم كاتەدا مریم (عليها السلام) زۆر بە سەرسوڕمانەوە بەو نێردراوەی خوای گەورەی ووت؟!

﴿من چۆن منداڵم دەبێتو دەبمە خاوەنی منداڵ كە هێشتا لەلایەن هیچ كەسێكەوە نەخوازراومو لاشەم بەر لاشەیهیچ كەسێ نەكەوتووە؟!و داوێن پیسیشم نەكردووەو ڕێگەی ناڕەوستم بەكار نەهێناوە؟!﴾.

لەوەلامدا نێردراوەكەی خوای گەورە كە (جبرەئیل) بوو پیی فەرموو:

﴿ئەوەی پێم ڕاگەیاندی ئاوەها جۆرەیەو خوای تۆ دەفەرمێت پێ بەخشینی كوڕێك بەبێ باوك بەلای منەوە –واتە خوای گەورە– بەمەریەم كارێكی زۆر ئاسانەو هیچ گرفتو ئورسیەكی تێدا نیە بەلای پەروەردگارەوە﴾.

قورئان لەم بارەیەوە دەفەرمێت:

﴿واذكر في الكتاب مريم اذ انتبذت من أهلها مكاناً شرقيا, فاتخذت من دونهم حجاباً فأرسلنا اليها روحنا فتمثل لها بشراً سوياً, قالت اني أعوذ بك با لرحمن ان كنت تقيا, قال إنما أنا رسول ربك لأهب لك غلاماً زكيا, قالت أنى يكون لي غلام ولم يمسسني بشر ولم ألئ بغيا؟! قال كذلك قال ربك هو علي هين﴾ (مريم:١٦-٢٠).

واتە: ئەی (محمد) (ﷺ) باسی بەسەرهاتو سەرگوزشتەی (مەریەم بکە) لەکاتێکدا لەگەڵو کەسو کارەکەی دورکەوتەوە بۆ مەبەستی خوا پەرستی و کەنارێکی هەڵبژاردبوو کە دەکەوتە ڕووکاری خۆرهەڵاتەوە، هەروەها لە نێوان خۆیو گەلەکەیدا بەربەستێکی دانابوو کە سەری قاڵ نەکەنو مەشغوڵی نەکەنو لە عیبادەتی دوا نەخەن، ئالەو کاتەدا (جبرەئیل) مان ناردەلای کە نموونەی پیاوێکی بەتواناو کامڵی دەنواند، مەریەم کاتێ ئەم ڕووداوەی بینی دەست بەجێ فەرمووی: من پەنا دەگرم بە خوای گەورە لە تۆ گەر تۆ کەسێکی لە خوایگەورە دەترسیتو گوێت لەم پەناگرتنەی منە بە خوای گەورە!!

(جوبرەئیل) یش پێی فەرموو بەتەنها من ڕەوانەکراو فروستادەی خوای گەورەم بۆلای تۆ نێردراوم کە ببمە هۆکارێکی خێر لەبەرامبەر ئەوەی کە خوای گەورە منداڵێکی پاکو بێتاوانو چاکت پێ ببەخشێ!! مەریەم لە وەڵامی ئەم قسەدا فەرمووی:

﴿من چۆن منداڵم دەبێو دەبمە دایک لەکاتێدا کەس گیانی بەرگیانم نەکەوتووەو پاشان داوێن پیسیشم نەکردووە لەگەڵ کەسدا!!؟﴾

(جوبرەئیل) لەوەڵامدا پێی فەرموو:

﴿ئەوەی پێم ووتی ڕاستەو هەروایەو دەبێت ببێتو خوای پەروەردگارت دەرفەرمێت ئەمە کارێکی ئاساییە لای منەوە﴾.

## سەرنجێک : (١)

زۆر جار قورئان لەباس کردنی ڕووداوو بەسەرهاتو چیرۆکە مێژووییەکاندا جۆرە ئسلوبێك بەکار دەهێنێت کە ببێتە هۆکاری سەرنج ڕاکێشانی خەڵکی.

بەڵێ بە ڕاستی گەر بەووردی سەرنجی ئەم ڕووداوەی پێشوو بدەینەوە بەشێوەیەکی خەیاڵیو لە مێشکی خۆماندا ڕووداوەکە بکەینە واقعێك ئەوە کارێکی زۆر سەرسوڕهێنەر دروست دەبێتو زۆربەی مرۆڤەکان لەبارەیەوە سەرسام دەبن، چونکە ئافرەتێکی داوێن پاکو خانەوادە بەرزو بێ گەردی وەك )(مریەم) (عليها السلام) بەتەنهاو لە

جێگایەکی چۆڵەوانیو دوور لە خەڵکدا بۆ مەبەستی خوا پەرستیو خۆنزیك خستنەوە لە پەروەردگاری عبادەتو پاكو بێ گەرد بۆ پەروەردگاری دەردەبڕێ بەو نیەتو مەبەستەی کە لە خراپەو تاوان دوور بکەوێتەوەو توشی گوناه نەبێت!!

بەڵام بەرەبەرە کارەکان بەرەو پێچەوانەوەبوون دەڕواتو ئەوەی (مریم) (عليه السلام) چاوەڕێی نەدەکرد ڕووی داو، ئەوەی کە لەناخی خۆیدا حسابی بۆ نەدوکرد هاتە دیو بەشێوەیەکی واقعیو بەرچاوو بینرا!!! کە ئەویش بینینو بەدی کردنی پیاوێکی کامڵو ڕێكو پڕی بێ کەمو کوڕی بوو!! بەڕاستی ڕوداوێکی سەیرە!!

ئاخۆ دەبێت (مریم) (عليه السلام) لەوکاتەدا چۆنو بە چ شێوەیەك ڕاچڵەکیبێت؟! ئاخۆ دەبێت ژمارەی ترپە ترپەکانی دڵی چەندە لە سنوری ئاسایی خۆی زیاتر لێی دابێت؟! و چووبێتە حاڵەتێکی نائاسایییەوە؟!

ئاخۆ دەبێت لەوکاتەداو لەناخی (مەریەم) (عليه السلام) چەند گومانی خراپ دروست بووبێتو شەیتانی نەفرین لێکراو چەند گومانی خراپی لە دڵی (مریم).(عليه السلام) دروست کردبێت؟!

بەهەرحاڵ گەرلەو کاتەدا خوای گەورە دڵ ئارامت نەکاتو سەکینەت نەڕێژێ بەسەر دڵو دەروونتدا ئەوە چون بەرەو مەرگودڵ لەکار کەوتنت زۆر ئاساییە.

بەڵام تۆ بڵێی خوای گەورە ئاگاداری ئەم حاڵەتە نەبێتو سۆزی خۆی نەڕێژێ بەسەر (مەریەم) دا؟! ئەو (مەریەم) ەی پەیمانی داوە کەوا سەرجەم ساتەکانی ژیانی لە خزمەتی پەروەردگاریدا سەرف بکاتو بە عیبادەت بەسەریان بەرێت؟

بەڵێ خوای گەورە بە (حیکمەت) و لێزانیو زانیاری بێ سنوری خۆی نەخشەیەکی بەرنامەییو زۆر گەورەی بۆ ئەم کارە داڕشتووەو ئیشێکی زۆر گەورەی بەم ڕوداوە هەیەو دەبێت ڕوش بداتو بەئەنجام بگاتو هیچ هێزو دەستەڵاتێکیش لە دنیادا نەتوانێت کە ڕێگری لە بەئەنجام گەیاندنی ئەم ویستەی پەروەردگاردا بکات، کە ئەویش لەدایك بوونو هاتنە دنیای پێغەمبەرێکی هەڵبژاردەو نەژادپاکی وەك (عیسا) بوو (عليه السلام) بەبێ باوك.

دور لە سۆزی باوك، دوور لە خۆشەویستی براو خوشك، بەڵام نزیك لە ڕەحمو سۆزو خۆشەویستیو پەیامی خوای گەورەو نزیك لە پاداشتی نەبڕاوەی پەروەردگاریو نزیك لە ڕێزی پەروەردگاری.

## لەدایك بوونی عیساو نارەحەت بوونی مەریەم (عليها السلام)

پاش ئەوەی (مەریەم) (عليها السلام) دڵنیا بوو لەوەی کە ئەو پیاوەی کە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکات نێردراوە لەلایەن پەروەردگارەوەیەکێکە لە فریشتە بەرێزو بێ تاوانەکانی خوای گەورەو ناووی (جبرەئیل) ە دڵ ئارام بوو هاتەوە حاڵەتی ئاسایی و تایبەتی خۆی، لەو کاتەدا ئەو (فریشتەیە) کە (جبرەئیل) بوو (عليه السلام): فوی کرد بە (مەریەم) داو مەریەم بەم (فووکردنەی) (جبرەئیل) سك پڕ بوو بە (عیسا) (عليه السلام)[*]، پاشان مریم ڕۆژ بە ڕۆژ (سك پڕیەکەی) زیاتر دەبوو لە ئاستی خۆی زیاتر بەرزدەبویەوە، هەر بۆیە لەم کاتەدا لە شەرمو حەیای خۆیدا هەڵساو ئەو جێگەو شوێنەی بەجێهێشتو بەرەو شوێنێکی تر بەڕێ کەوت کە دوور تربێت لەکەسو کاری خەڵکی ئەو شوێنەی کە تییدا دەژیا، قورئان لەم بارەوە دەفەرمێت:

﴿فحملته فانتبذت به مكانا قصيا﴾ (مريم:٢٢).

واتە: مەریەم بە (عیسا) سك پڕ بووو هەڵسا بە کۆچ کردنی بۆ شوێنێکی دوورتر لەو جێگاو شوێنە ی تر.

گەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین ئەوە دەبینین کە هەندێ ڕووداووباسی تێدا باس نەکراوە کە بریتین لە:

١- ئایا جبرەئیل (عليه السلام) لە دوورەوە فوی کرد بە (مەریەم) دا یان لە نزیکەوە!!؟؟

٢- ئایا (جبرەئیل) (عليه السلام) فوی کرد بە چ بەشێکی (مەریەم)دا !؟ ئایا سینگی بووە یان دەمی؟! یان داوێنی؟!

٣- ئایا (مەریەم) وەك ئافرەتانی خاوەن مێرد سکەکەی بە (٩) مانگ داناوە یان بەکەم تر؟! یان بە زیاتر؟! یان گەر بە شێوەیەکی تر بڵێین:

## ئایا ماوەی سکەکەی بە گوێرەی باوی ئافرەتان بووە یان جیاواز بووە؟!

ئەمانەو چەندین پرسیاری تری لەم جۆرە دروست دەبن لەو ڕووداوە کە قورئان باسی لێوە نەکردووەو نەی کردۆتە باسێکی سەرەکی و مایەی سوود لێ وەرگرتنی.

بەڵێ جا گەر کەسێ پرسیار بکاتو بڵێ: ئاخۆ قورئان بۆچی باسی ئەم خاڵانەو چەند خاڵێکی تری لەم جۆرە نەکردووە؟! لە وەڵامدا دەڵێین:

---

(*) (تفسير ابن كثير) ج٣ / (ص: ١٢٢) ط دار المعرفة ١٩٩٦.

وەك ئاشكرایە كە ئایەتەكانی قورئان بە زۆری دەدوێ دەربارەی ئەو مەسەلانە كە زۆر پێویستن بۆ مەبەستی ژیانی خەڵكی جا لە هەر بوارێك دا بێت لە بوارەكانی (ئابووری، مێژوویی، سیایی، سەربازی، تەشریعی، دنیایی، قیامەتی،چیرۆكی و سەرجەم بوارەكانی تر).

بەڵێ هەر لەم ڕوانگەیەوە سەیرێكی ئەو پرسیارانەی سەرەوە بكەین ئەوە زۆر بەئاسانی دەتوانین وەڵامی بدەینەوە بەم شێوەیە:

((بێگومان باس كردنی ئەو حاڵەتانەی سەرەوە كە ئێمە كردوومانن بە پرسیار هیچ بایەخێكی ئەوتۆی نیە لە چیرۆك و بەسەرهاتی (مریم) دا، پاشان موسڵمانان هیچ سودێك وەرناگرن بەشارەزابوونیان لەوەی كە بزانن ئاخۆ (جبرەئیل) (عليه السلام) لە دوورەوە فووی كردووە بە (مریم) دا یان لە نزیكەوە، یان (مریم) (عليها السلام) بە ماوەی (٩) مانگ هەروەك ئافرەتی ئاسایی سكەكەی داناوە یان (٢) مانگ یان زیاتر؟!

دڵنیابن لەوەی گەر باس كردنی ئەم حاڵەتانە سوودی هەبوایە ئەوە خوای گەورە هەروەك ڕوداوو بەسەرهاتەكانی تر باسی دەكردوو پاشان لە دوای ئەوە موسڵمانان پەندو ئامۆژگاری و سودیان وەك سەرجەم بابەتەكانی تر لێ وەردەگرت، كەواتە ئێستە هەرچ وەڵامێك بۆ ئەو پرسیارانە دابنێین ئەوە زیادەڕەویە لەسەر بنچینەیەكی ناڕەواو نازانستیەو هیچ سوودوو بایەخێكی نیەو بنەمای باس و بەسەرهاتە قورئانیەكە ناگۆڕێت.

باشترین وەڵامیش بۆ ئەو پرسیارانەو سەدان پرسیاری تری لەوجۆرە ئەوەیە كە بڵێین:

(خوای گەورە زاناترە بە ڕاستی مەسەلەو ڕووداوەكان) (والله أعلم بالصواب).

## سەرنجێك (٢):

هەروا تێپەڕبوون و هەنگاونان بەسەر باسەكاندا كارێكی باش نیەو ماف خواردن و غەدركردنە لەوباس و بەسەرهاتەدا بەڵێ هەر لە ڕووداوی سك پڕبوونی (مریم) بە (عیسا) (عليه السلام) پێویستە كەوا هەندێ بیر لەو حاڵەتە بكەینەوەو لەشاشەی ڕاستەقینەو گەورەو بێ گەردی قورئانەوە سەیرێكی ئەو ڕوودلوە بكەینوو پاشان بڵێین:

((بەڕاستی ڕوودلوێكی كەم وێنەو سەیرە كەوا (مەریەم) یەكی داوێن پاك و خوا پەرست كە لە خانەوادەیەكی پاكی پێغەمبەرانەوە هاتووەو پاشان لە ناو هەموو گەلەكەیدا با ئافرەتێكی داوێن پاك و بەئیمان ناسراوە، بەڵام ئێستەو لەم كاتەدا وا بەتەمەنێكی گەنجی و هەرزەكاری و بە (كچێتی)و بەبێ ئەوەی كەسێ بوبێتە مێردی و كاری شەرعی و حەڵاڵی لەگەڵ دا ئەنجام دابێت.

سکی پڕ بووەو منداڵێکی تێدا هەڵگرتووە!!!.. بەڕاستی ڕووداوێکی زۆر ناڕەحەتەو کەم کەس بتوانێ خۆی ڕاگیر بکات لەبەرامبەریداو خۆی نەکوژێت!!

بەڵام بەهەرحاڵ گەر کەسێ بە ئومێدی پەروەردگاری بێت ئەوە دڵنیا دەبێت لەوەی کە خوای گەورە دەستی لێ بەرنادات و سەربەرزی دەکات (چ لە دنیاو چ لە قیامەتدا).

## چۆنیەتی هاتنە دنیای عیساو ناڕەحەت بوونی دایکی

ڕۆژ بە ڕۆژ ئازاری منداڵ بوون تەنگی بە (مەریەم) ی داوێن پاک و بێ چارە هەڵدەچنی و سات سات بە (ماددی و مەعنەوی) حاڵی ئاسایی (مەریەم) (عليها السلام) ڕووی لە خراپی و بێ زاری دەکرد، لەم کاتەدا (مەریەم) (عليها السلام) زانی کەوا کاتی منداڵ بوونی هاتووەو پێویستە سکەپڕەکەی دابنێ، هەر بۆئەم مەبەستە بوو کەوا هەر چۆنێک بوو خۆی گەیاندە دار (خورما) یەک و دەستی گرت بە یەکێ لە پەلەکانیەوە بۆ ئەوەی خۆی پێ بە هێز بکات بەو مەبەستەی زوو و بە ئاسانی ئەو منداڵەی ببێ!!

﴿فأجاءها المخاض الى جذع النخلة..﴾ (مريم:٢٣).

واتە: (مريم) (عليها السلام) بە ژانی منداڵبوونەوە خۆی گەیاندە دار خورمایەک بۆ مەبەستی دەست پێوە گرتن و خۆ بەهێز کردنی.

بەڵێ لەم کاتە ئاسک و دژوارەدا باشترین ڕێگە کە (مريم) (عليه السلام) بۆ مەبەستی خۆ دەربازکردن هەڵی بژێرێ بریتی‌یە لە خۆزگە خواردن بە مردن و لە بیر چوونەوەی لە دڵ و هۆشی خەڵکیدا، هەر بۆیە لەم کاتەدا پڕ بە دڵ هاواری کردوو فەرموی:

﴿قالت يا ليتني مت قبل هذا وكنت نسياً منسيا﴾ (مريم:٢٣).

واتە: (مەریەم) ووتی: خۆزگا پێش ئەوەی ئەم حاڵەتەم بەسەر بێت بمردمایەو لەبیر خەڵکی بچومایەتەوەو کەس باسی نەکردمایە!!

گومانی تێدا نیە کەوا ئەم حاڵەتە ناخۆشەی وا بەسەر مەریەم دا هاتووە ویستی خوای گەورەیەو دەستەڵات و خۆزگەی کەسی تێدا نیەو بە ویستی کەس ڕووی نەداوە، بەڵام ئایا تۆ بڵێی هەروا خوای گەورە مەریەم بەو شێوەیە بهێڵێتەوەو حسابێکی بۆ نەکات و دڵ نەوایی نەداتەوە؟!

یان بە شێوەیەکی تر بڵێین:

ئەوەی بەسەر مەریەم دا هاتووە لەم کاتەدا بەوویستی پەروەردگاریەتی و خوای گەورە بەفەرمانی خۆی ئەم ڕووداوەی داڕشتووە، جا لەم کاتەدا ئایا دەگونجێ کەوا خوای گەورە ڕەحم و دڵ ئارامی و دڵخۆشی (مەریەم) ی بێ کەس جگە لە خوای گەورە نەداتەوە؟!

لەوەلامدا دەڵێین:

پاك‌و بێ گەردی بۆ پەروەردگاری كاربەجێ كە كاری بێ سەرەو بەرەو بێ حیكمەت ئەنجام بدات (سبحانەو تعالی) بەڵكو خوای گەورە سەرجەم بڕیارو فەرمانەكانی وەك بەرنامە دارێژراوەو حسابی تەواوو گونجای بۆ كراوەو لەپشت هەموو فەرمان‌و بڕیارێكیشە وە حیكمەتێكی زۆر گەورە پەنهان دراوە كەمرۆڤەكان لێی ئاگادار نین تاڕوداوەكە ئاشكرا دەبێت‌و خوای گەورە پەردە لەسەر ئەو حكمەتە هەڵدەگرێ.

(انشاء الله) لە درێژەی ئەم چیرۆكەو لە باسەكانی داهاتوودا سەرجەم ئەوو حكمەتانە ئاشكرا دەكەین.

بەڵێ ئا لەم كاتەدا بوو كەوا (مریم) (عليها السلام) بە ویستی پەروەردگاری بالادەست‌و كارزانی سكەپڕەكەی داناو ڕزگاری بوو لە ئێش‌و ئازاری منداڵ بوون بەلام لەپاش ئەم ڕووداوە مەریەم چەند دیاردەو ڕووداوێكی زۆر لەوە سەرسوڕهێنەر تروو سەرنج ڕاكێشەر تری بینی كە ئەویش بریتی بوو لەوەی كە گوێبیستی هەندێ قسەی چاوەڕوان نەكراووو دڵ خۆش كەر بوو كە لە ژێر داوێنیەوە پێی فەرموو:

((ئەی دایكی شیرین‌و بێتاوان‌و داوێن پاك‌و خواپەرستم بە هیچ شێوەیەك دڵگران‌و خەم بار مەبەو مەترسە لەوەی كە خەڵكی پرسیاری منت لێ بكەن‌و بوختان‌و قسەی درۆو ناڕەوات بۆ دروست بكەن، دووبارە ئامۆژگاریت دەكەم بەوەی كە تەنها پشت بە پەروەردگارت ببەستەو لە لۆمەو قسەی خەڵكانی نەفام مەترسە!! ئەی دایكی بەڕێزم سەیری خوار خۆت بكە كەوا پەروەردگارت جۆگەو ئاوی سازگاری بۆ هەڵقوڵاندویت‌و پاشان سەیری سەروو خۆتیش بكە كەوا دار خورمای لێیەوەو پەلەكانی ڕابوەشێنە تاوەكوو خورمای تەڕوو جوان‌و تازە بكەوێتە خوارەوە.

ئەی دایكی خۆشەویستم بخۆو بخۆرەوە نۆشی گیانت بێت‌و دڵ گران مەبە.

قورئان لەم بارەیەوە دەفەرمێت: ﴿فناداها من تحتها ألا تحزني قد جعل ربك تحتك سريا * وهزي اليك بجذع النخلة تساقط عليك رطباً جنياً * فكلي واشربي وقري عينا..﴾ (مريم:٢٤-٢٦).

واتە: مەریەم پاش ئەوەی منداڵەكەی بوو دەست بە جێ منداڵەكەی كەوتە قسەو بانگی مريم ی كرد لە ژێر داوێنەوەو پێی ووت: دڵ گران مەبەو خەفەت مەخۆ چونكە پەروەردگارت لەژێرتەوە ئاوو جۆگەی سازگارو بێ گەردی بۆ فەراهەم هێناویت، پاشان پەلی ئەو دار خورمایەش ڕابوەشێنە تاوەكوو خورمای جوان‌و تازەت بۆ بكەوێتە خوارەوە، كەواتە ئەی دایكی بەڕێزم بخۆو بخۆرەوەو دڵ خۆش بە و دڵ گران مەبە.

(سید قطب) لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا دەفەرمێ:

((یا لله!! طفل ولد اللحظة ینادیها من تحتها، یطمئن قلبها ویصلها بربها، ویرشدها الی طعامها وشرابها، ویدلها علی صبحتها وبرهانها))(٦).

واتە: ئەی پەروەردگار، منداڵێك تازەو لەوكاتەدا لەدایك بووبێت بانگی دایكی دەكات لە ژێر داوێنیەوە، بە هۆی ئەو بانگ كردنەیەوە دڵی دایكی ئارام دەكات و دەیگەیەنێت بە پەروەردگاری، هەروەها ڕێ نمینی دەكات لەسەر خواردن و خواردنەوەی.

## عیسا (عليه السلام) ئامۆژگاری دایكی دەكات

پاش ئەوەی كەوا مەریەم (عليها السلام) دڵی ئارام بویەوەو زانی ئەم منداڵەی كە بوویەتی یەكێكە لە (معجزة) و كارەگەورەكانی پەروەردگاری خۆشی و دڵ فراوانی لە هەموو كەنارەكانەوە ڕوویان تێ كرد، بەڵام ڕووداوەكان ئابەم جۆرەو لەم كاتەدا هەروا بەئاسانی كۆتاییان پێ نایەت و ڕووداوی گەورەترو سەرسوڕهێنەر تر وان لەبەردەمدا كە ئەویش بینینی (مەریەم) ە بەو منداڵەو لەلایەن گەلەكەیەوە.

بەڵێ هەر لەبەرئەوە بوو كەوا مەریەم بۆ جارێكی تر دڵی تەنگ بوویەوەو خەم و پەژارە لەسەر دڵ و دەروونی تەمیان دروست كرد، بەڵام خوای گەورە كاریبەم ڕووداوە هەیەو نەخشەو بەرنامەیەكی زۆر ووردی بۆ داناوە.

ئا لەم كاتەدا بۆمەبەستی دڵ نەوایی كردنەوەی (مەریەم) خوای گەورە فەرمانی كرد بە (عیسا) (عليه السلام) كە ئەم چەند ئامۆژگاری‌یەی دایكی بكات كە بریتی بوون لە:

((ئەی دایكی شیرینم كاتێ منت بەدەستەوەیەو باوەشت كردوم خەڵكی دەت بینن و پرسیاری منت لێ دەكات!!؟ تۆ لەم كاتەدا هەركەسێكت بەدی كردوو پرسیاری منی لێ كردی وەڵامیان مەدەرەوەو بە جوڵەی دەستت (اشارەت) بكە بۆ من و تێیان بگەیەنە كەوا من واجبم كردووە لەسەر خۆم كە بەڕۆژوو ببم و بە هیچ شێوەیەك قسە لەگەڵ كەسدا نەكەم و پاشان بۆ جاری دووەم بە (اشارەت) تێیان بگەیەنە كەوا لە بری (من) –واتە عیسا– (عليه السلام) وەڵامیان دەدەمەوە.

قورئان ئەم ئامۆژگاریەمان بۆ باس دەكات و دەفەرمێ:

(٦) في ظلال القرآن / ج٥ (ص: ٤٣٢).

﴿ فإما ترين من البشر احداً فقولي اني نذرت للرحمن صوماً فلن اكلم اليوم انسيا﴾ (مريم:٢٦).

واتە: ئەی دایکی بەڕێزم، گەر هەر کەسێکت بینی ئەوە پێی بڵێ کەوا من فەرزم کردووە لە سەر خۆم کە ئەمڕۆ بە ڕۆژوو موو قسە لەگەڵ کەسدا نەکەم.

◐ گەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین ئەوە دوو وشەو دوو زاراوە بەدی دەکەین کە ئەوانیش بریتین لە بە ڕۆژوو بوونو قسەنەکردن (الصوم، فلن اكلم)، سەرنج دانو بیرکردنەوە لەم دوو حاڵەتە پرسیارێك دروست دەکات کە ئەویش بریتی‌یە لەوەی کە:

ئایا قسەنەکردن چ پەیوەندی‌یەکی هەیە بە ڕۆژووگرتنەوەوە؟!

وەڵام/ بێ‌گومان وەڵامی ئەم پرسیارە لە قورئانو فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) باس نەکراوە بەڵام زانایان لە کۆندا هەندێ ڕاو بۆچوونی جیاوازیان لەبارەیەوە هەیە کە هەندێکیان وەك: ((انس ی کوڕی مالك)) دەفەرمێت: وشەی (الصوم) کە ڕۆژووە بەمانای (الصمت) واتە: بێ‌دەنگیو قسەنەکەردن دێت لە ئایەتەکەدا.

هەندێکی تر وەك زانایانی پایە بەرز (ابن عباسو ضحاك) دەفەرموون بەهەردوو ماناکە دێت کە لەگەڵ بەڕۆژوو بونەکەدا قسەیان نەکردووە[٧].

بەهەمان شێوە (ابن كثير)یش لەم بارەیەوە دەفەرمێت:

((والمراد انهم كانوا اذا صاموا في شريعتهم يحرم عليهم الطعام والكلام))[٨].

واتە: مەبەست لەم باسەدا ئەوەیە کە لە شەریعەتی ئەوکاتەدا وابووە گەر بەڕۆژوو ببونایە ئەوە خواردنو قسەکردنیان لێ قەدەغەو حەرام بوو.

وە خوای گەورەش باشتر دەزانێو زاناترە (والله اعلم بالصواب).

## قسەو هەڵویستی خەڵکی لەبەرامبەر مەریەمو منداڵە کۆرپەکەی

گومانی تێدا نیە کەوا سروشتی خەڵکی بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی وەها بووە کە لە زۆر حاڵەتدا خێراو دەست بەجێ حوکمیان داوە بەسەر ئەوانەدا کە ڕوویداوە، بێ ئەمەی حیسابی بۆکەنو لێی بکۆڵنەوەو هەوڵ بدەن کە بگەننە ڕاستی مەسەلەکان، هەر لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین کەوا هەڵویستی ئەم گەلە دیاری بکەین لەبەرامبەر مەریەمو کۆرپەکەی کە بەم شێوەیە بوو:

---

(٧) تفسير ابن كثير ج٣ / (ص: ١٢٤).

(٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

((کاتێ مەریەم دڵنیا بوو لەوەی کە ڕاستەو خۆ دەستی پەروەردگاری لەگەڵەو سەرجەم کارەکانی دەبات بەڕێوە، زۆر بە ئازایانەو بە چاو نەترسی کۆرپەلە شیرەخۆرەکەی باوەش کردوو بەرەو ئاوایی و بۆ ناو گەلەکەی گەڕایەوە)).

لەم کاتەدا خەڵکی (مەریەم) یان دەبینی و زۆر بەسەرسوڕمان و پرسیارەوە دەیان ووت: ئەی مەریەم ئەم منداڵەت لە کوێ بوو؟! ئەی (مەریەم) بەڕاستی کارێکی باشت نەکردووەو داوێن پیسی و زیناکردن پیشەی تۆ نەبووە؟!

ئەی (مەریەم) تۆ چۆن ئەم کارەت ئەنجام دا لەکاتێکدا نە باوکت پیاوێکی داوێن پیس بووەو نە دایکیشت ئافرەتێکی شەرەف فرۆش بووە!؟

ئەی (مەریەم) تۆ لە خانەوادەو کەس و کاری (هارون) پێغەمبەری چۆن ئەم کارەت ئەنجام داو ئەو منداڵە ناشەرعیەت لەگەڵ خۆتدا هێناوە؟!

ئەی (مەریەم) تۆ کەسێك بوویت!! سەرجەم کاتەکانی ژیانت لە خزمەتی ماڵی خواو عیبادەت دا دەبردە سەر!! ئێستا بۆ هەڵسایت بەم تاوانەو سەری ئێمەشت سوك کرد؟!

خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرمێت:

﴿فأتت به قومها تحمله قالوا يا مريم لقد جئت شيئاً فريا * ياأخت هارون ماكان أبوك امرأ سَوء وماكان أمك بغيا﴾ (مريم:٢٧-٢٨).

واتە: (مەریەم) گەڕایەوە بۆ ناو گەلەکەی و (عیسا) ی بە باوەشەوە بوو، کاتێ گەلەکەی ئەم دیاردەیان بینی بە مەریەم یان ووت: ئەی مەریەم بەڕاستی کارێکی گەورەت ئەنجام داوە کە بەبێ ئەوەی شوو بکەیت منداڵت هێناوەتەوە لەگەڵ خۆتدا، ئەی خوشکی (هارون) نە باوکت پیاوێکی داوێن پیس و بەدکار بووە، نە دایکیشت ئافرەتێکی زیناکەرو خراپ بووە.

بەهەرحاڵ (مەریەم) لە هەموولایەکەوە هێرشی دەکرێتە سەرو تاوانی زینا چێتی و داوێن پیسی دەدەنە پاڵ، بەڵام ئەم هیچیان وەڵام ناداتەوەو قسەکانیان وەك قسەی منداڵێك دێتە بەر گوێ کە تازە فێری قسەکردن بووبێت و حەز بە قسە فڕێدان بکات.

لەگەڵ ئەوەشدا (مەریەم) تەنها خوای گەورەو پاشان ئەو منداڵەی دەستی شك دەبات کە بەرگری لێ بکەن و شاهیدی لەسەر داوێن پاکی و ڕەوشت بەرزی و بێتاوانی بدەن.

بەڵێ بۆیە لەم کاتەدا (مەریەم) بە (اشارەت) دەستی ڕاکێشا بۆ (عیسا) کەبەباوەشیەوە بوو و گەلەکەی تێ گەیاند کەوا من بە ڕۆژووم و قسەناکەم و ئەو منداڵە وەڵامی سەرجەم پرسیارەکانتان دەداتەوە.

کاتێ گەلەکەی (مەریەم) ئەم دیاردەیان بەدی کرد لە (مەریەم) کە قسەیان لەگەڵدا ناکات و وەڵامیان ناداتەوە، ڕق و قینیان لە مەریەم زیاتر بۆ دروست بوو و خۆیان

بەتەواوی دڵنیا کرد لەوەی کە مەریەم زینای کردووەو لە بێ چارەی‌و تەریقی خۆیدا قسەیان لەگەڵدا ناکات‌و وەڵامیان ناداتەوە.

هەربۆیە لەم کاتەدا زۆر بە سەرسوڕمان‌و توڕەییەوەبە (مەریەم) یان ووت:

((ئەی مەریەم تۆ خۆت وەڵامان نادەیتەوەو قسەمان لەگەڵدا ناکەیت‌و ئیشارەت دەکەیت بۆ منداڵە شیرە خۆرەکەی دەستت کە وەڵاممان بداتەوە!! چۆن‌و بە چ شێوەیەك ئەو منداڵە وەڵاممان دەداتەوە لەکاتێکدا کە منداڵەو لە بێشکەدایە، یان بە چ شێوەیەك قسە لەگەڵ منداڵێکدا بکەین کە شیرە خۆرەیەو کاتی ئەوەی نەهاتووە کەوەك کەسێکی ئاسایی قسەبکات‌و لەمەبەسەکانمان تێ بگات‌و پاشان وەڵاممان بداتەوە؟!

قورئان لەم بارەیەوە دەفەرمێت:

﴿فأشارت اليه قالوا كيف نكلم من كان في المهد صبياً﴾ (مريم:٢٩).

واتە: (مەریەم) (اشارەتی) بۆ عیسا کرد، ئەوانیش بەسەرسوڕمانەوە ووتیان: چۆن قسە لەگەڵ کەسێکدا بکەین کە جاری منداڵەو وا لەناو بێشکەدا؟!

گەر سەرنجێکی خێرای ئەم ڕووداوە بدەین ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە گەلەکەی (مەریەم) تەنها ڕووکارە ماددی‌و دنیاییەکانیان حساب کردووەو تەنها بەو پێوەرەش کارو ڕووداوەکانیان هەڵسەنگاندووە، بەڵام لە ڕاستیدا وا نیە چونکە خوێندنەوەی لایەنە مەعنەوی‌و ڕۆحیەکان گەورەترو بەهادارترن لەلایەنە ماددی‌و دنیاییەکان بەلای هەموو کەسێکی خاوەن ژیریەوە.

بەڕاستی ئەم گەلە بێ ئاگابوون لە گەورەی‌و دەسەڵاتی پەروەردگاریان‌و بە حسابی خۆیان وایان داناوە کە مرۆڤ تانەگاتە تەمەنی (٥ تا ٦)ساڵی ئەوە بەتەواوی ناتوانێت قسە بکات‌و لەپرسیار تێ‌بگات‌و پاشان وەڵامی بداتەوە، ئەمەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ژیری کەم‌و کوڕوو سنوورداری مرۆڤەکان.

## وەڵامی (عیسا) (عليه السلام) بۆ گەلەکەی

پاش ئەوەی گەلەکەی (مەریەم) لەسەرجەم قسەو پرسیارو بوختان هەڵبەستن‌و ووتەکانیان بوونەوە خوای گەورە فەرمانی کرد بە عیساو بەو منداڵیەو بەباوەشی دایکیەوە دەستی کرد بە وەڵام دانەوەی سەرجەم پرسیارو گومانەکانیان‌و پێی فەرموون:

ا) ﴿اني عبد الله﴾ واتە: ئەی گەلەکەم من بەندەی مل کەچی خوای گەورەم.

ب) ﴿ آتاني الكتاب﴾ واتە: لەلایەن پەروەردگارمەوە پەرتوکێکی ئاسمانیم پێ بەخشراوە -بەناوی انجیلەوە-.

ج) ﴿وجعلني نبيا﴾ واتە: پەروەردگارم دەم كات بە پێغەمبەر، و ئەو شەرەفە گەورەیەم پێ دەبەخشێ.

د) ﴿وجعلني مباركاً اينما كنت﴾ واتە: پەروەردگارم من دەگێڕێ بەكەسێ كە پیرۆزو بە قیمەت بم لە هەر جێگاو شوێنێكدا بم.

ﻫ) ﴿وأوصاني بالصلاة والزكاة مادمت حيا﴾ واتە: پەروەردگارم فەرمانی پێ كردووم بە نوێژكردن‌و زەكات دان هەتا لە دنیادا بەو زیندوو بم.

و) ﴿وبراً بوالدتي﴾ واتە: پەروەردگارم منی گێڕاوە بە ڕۆڵەیەكی گوێڕایەڵ بۆ دایكم كە چاكە بكەم لەگەڵیداو گوێڕایەڵی فەرمانەكانی بم.

ن) ﴿ولم يجعلني جباراً شقيا﴾ واتە: پەروەردگارم نەی كردووم بەكەسێكی ستەم كارو خۆ بەزل زان كە سەرپێچی فەرمانەكانی بكەم‌و پاشان لەگەڵ دایكمدا خراپ بم.

ح) ﴿والسلام علي يوم ولدت ويوم أموت ويوم أبعث حياً﴾ واتە: سەلامی پەروەردگارم لێ بێت لەو ڕۆژەی كەلەدایك بووم‌و پاشان لەو ڕۆژەی كە دەمرم‌و لەو ڕۆژەی كە زیندوو دەكرێمەوە.

بەڵێ (عیسا) (عليه السلام) بەم شێوەیە وەڵامی گەلەكەی دایەوەو قورئانیش لەم بارەیەوە دەفەرمێت:

﴿قال اني عبد الله آتني الكتاب وجعلني نبيا * وجعلني مباركاً أين ما كنت وأوصاني بالصلاة والزكاة مادمت حياً * وبراً بوالتي ولم يجعلني جبارا شقيا * والسلام علي يوم ولدت ويوم أموت ويوم أبعث حياً﴾ (مريم:٣٠-٣٣).

پاشان خوای گەورە كۆتای ئەم ڕووداوو بەسەرهاتە كۆتایی پێ دێنێت‌و دەفەرمێت:

﴿ذلك عيسىٰ ابن مريم قول الحق الذي فيه يمترون * ماكان لله أن يتخذ من ولد سبحانه اذا قضى أمراً فانما يقول له كن فيكون * وان الله ربي وربكم فاعبدوه هذا صراط مستقيم﴾ (مريم:٣٤-٣٦).

واتە: ئەمەی باسمان كردن لە دەربارەی عیساوە ووتەیەكی ڕاستە كەخەڵكی تێیدا دوو دڵن، وەنەبووەو ناش بێت‌و ڕەوا نیە كە خوای گەورە منداڵی هەبێت، پاك‌و بێگەردی بۆ خوای‌گەورە، وە هەركاتێ خوای گەورە ویستی ئەنجام دانی كارێك بوو ئەوە لە (كن، فيكون) یێك دا دەبێت.

پاشان عیسا فەرمووی: بە ڕاستی خوای گەورە پەروەردگاری منیش و ئێوەشە و بەچاکی بی پەرستن بەڕاستی ئەمە ڕێگای ڕاستە.

## چەند پەندو ئامۆژگاریەکی گرنگ لە باس و بەسەرهاتەکانی بەندی یەکەم

١- خێزانەکەی (عمران) لەکاتی داواکردنی کوڕەیەک لە خوای گەورە فەرمووی: ﴿ رب اني نذرت لك .. ﴾ (ال عمران:٣٥).

واتە: ئەی پەروەردگارم من (نەزر) م کردوە لەسەر خۆم کە ئەگەر کوڕت پێدام ئەوە بیکەمە خزمەت کاری ماڵی تۆ.

گەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین ووشەو زاراوەی (نەزر) بەدی دەکەین کەواتە زۆر پێویستە بزانین (نەزر) مانای چیەو لە اسلامدا بە چ شێوەیەک باس کراوە.

پێناسەی (نەزر): (هو الزام المسلم نفسه القيام بعبادة لله تعالى او بعمل صالح غير واجب عليه اصلاً تجاه ربه)[٩].

واتە: نەزر بریتی‌یە لەوکارەی کە کەسێکی موسڵمان لەسەر خۆی فەرز دەکات کە هەڵبسێ بەئەنجام دانی لەپەرستنی خوای گەورەدا یان لە کارێکی چاکدا بەبێ ئەوەی لەلایەن خوای گەورەوە ئەو کارە لەسەر بەندەکانی فەرزکرابێت.

بەڵێ (نەزر) بەمانایەکی تر بەوە دەوترێت کە مرۆڤێکی موسوڵمان هەڵدەستێ بەفەرز کردنی کارێکی چاك یان عیبادەتێکی زیادە لەفەرزەکان کە ئنجامی بدات، بۆ نموونە: ئەو کەسەی کە (نەزر) ەکەی کردووە دەڵێت:

بەڵێن بێت ئەم شەو تابەیانی نەنووم و خەو لەچاوانم نەیەت و بەردەوام عیبادەتی پەروەردگارم بکەم!!

گەر سەرنجێکی ئەم نموونەیە بدەین ئەوە بەدی دەکەین کە خوای گەورە فەرزی نەکردووە لەسەر هیچ کەسێ کە شەو تابەیانی نەنوێت و عبادەت ئەنجام بدات، بەڵکو ئەووکەسە خۆی لەسەر خۆی واجب دەکات.

---

(٩) معالم التوحيد / مروان ابراهيم القيسي.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا گەر هەر کەسێك (نەزر) ی کردوو شتێکی زیادە لەغەیری فەرزەکانی خوای گەورە لەسەر خۆی فەرز کرد ئەوە دەبێت وەفای پێوە بکاتو پەیمانەکەی بەرێتە سەر، گەرنا ئەوە دەبێت کەفارەتەکەی بدات کە سێ شتە:

*ا- یان دەبێت (١٠) فەقیر تێر بکات.*

*ب- یان دەبێت (٣) ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت.*

*ج- یان دەبێت بەندەیەکی ژێر دەستە ڕزگار بکات.*

## حوکمی (نذر) لە ئیسلامدا

بێگومان (نەذر) کردن لە اسلامدا (مەکروهە)، واتە: فەرزکردنیکارێکیزیادە لەسەر خۆتەکارێکی باش نیە لە اسلامداو نەکردنی گەلێك باشترە چونکە (نەذر) کردن هیچ لە بڕیاری خوای گەورە ناگێڕێتەوەو قەدەری خوای گەورە ناگۆڕێت.

بۆ نموونە: کەسێك خۆشەویستێکی نەخۆشەو حاڵەتی باش نیە، لەم کاتەدا ئەو کەسەی کە خۆشەویستی نەخۆشەکەیە دەڵێت:

((ئەی پەروەردگارم (نەذر) بێت گەر فلانە کەس چاك بویەوە ئەوە خێرێکی گەورە ئەکەم)).

بەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانمان پێ دەکات کە ئەم جۆرە کارانە واجب نەکەین لەسەر خۆمانو تابۆمان دەکرێت دەست ی دووعاو پاڕانەوە بەرز بکەینەوە بۆ لای پەروەردگارمان بۆ مەبەستی لاچوونی بەڵاو ناخۆشیەکانو بەدەست خستنی خۆشیو شتە باشەکان نەك بۆ بەرژەوەندیەکی خۆمان (نەذر) بکەینو شتی زیادە لەسەر خۆمان فەرز بکەین هەروەك دەفەرمێت:

((لا تنذر فاءن النذر لا يغني من القدر شيئاً وانما يستخرج من البخيل)) (رواه البخاري ومسلم والترمذي والنسائي)

واتە: (نەزر) مەکەنو شتی زیادە لەسەر خۆتان فەرز مەکەن چونکە (نەذر) کردن هیچ لە (قەدەر) ی خوای گەورە ناگۆڕێت، وە (نەذر) تەنها لەکەسی بەغیلو ڕەزیلەوە دەردەچێت.

بەڵێ لەگەڵ ئەوەی کە (نەذر) کردن کارێکی باش نیە لە اسلامداو حوکمی (مکروە) ە، دراوە بەسەردا لە هەمان کاتیشدا جۆرێکە لە جۆرەکانی (عبادەت) کردنی خوای گەورە.

هەر لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین کەوا بڵێین:

دایکی مەریەم (ڕەزای خوای لێ بێت) وەك دەربڕینی شێوە عبادەتێك ی زیادە لەسەرو عبادەتەکانی ترەوە بۆ خوای گەورە ئەم کارەی لەسەر خۆی فەرز کردوو (نەذر) ی کرد کەوا ئەو منداڵەی لە ناوسکی‌دایە بیکاتە خزمەت کاری ماڵی خوای گەورە.

کە ئەمەش بەڵگەی بەهێزە لەسەر بەرزیو داوێن پاکیو بۆ خوا گونجانی دایکی مەریەم.

٢- هەر لەباسی دایکی مەریەم دا خاڵێکی گەورەتر هەیە کە پەندوو ئامۆژگاری لێ وەربگرین کە ئەویش بریتی‌یە لەوەی کە بڵێین:

بەڕاستی ئەمە نموونەی دایکی بەڕێزو خواپەرستو بە ایمانە لەکاتێکدا منداڵەکەی وا لە سکداوو تەنها هەناسەیەکی دنیای هەڵنەمژیووە، دەست بەجێ بڕیاری‌داوە کە لە پێناوی خواو ماڵی خوای گەورەدا بەکاری بهێنێت ئەم ڕووداوە گەرەترین لایەنی پەروەردەیی‌و ئامۆژگاری تێدایەو بۆ باوکانو دایکانو پەورەدەکەری منداڵان بە گشتی.

باوکانو دایکانو ئەو کەسانەی کە خۆتان بەپەروەردەکەری منداڵان دەزانن باش گوێچکەی دڵەکانتان بدەنە هەڵوێستی دایکی مەریەم لەبەرامبەر کۆرپەو جگەر گۆشەکەی ناوسکی، کە قسەتان لەگەڵدا دەکاتو بەزمانی حاڵ پێتان دەڵێت:

((ئەی باوکان؟! باش بزانن‌ودڵنیا بن لەوەی کەوا لێپرسراوی منداڵانن!! باش بزاننو دڵنیا بن لەوەی کە ئەو کۆرپەلەی وا ژێر چاودێری‌و ئامۆژگاری تۆدا ئەمانەتێکەو خوای گەورە لای تۆ داینـاوەو تۆی بە شیاوی ئەو ئەمانەت لادانانە زانیوە!! کەواتە بەهۆیەوە لە خۆت مەگۆڕی‌و بەباشی ئەوئەمانەتە ڕابگرەو بیگەیەنەرە شوێنو جێگای خۆی‌و خیانەتی تێدا مەکە!!

گەیاندنی ئەو ئەمانەتە کە —منداڵ— ە بە شوێنی خۆی بریتی‌یە لە باش پەروەردەکردنو تێگەیاندنی لە دینی خوای گەورەو پاشان فێرکردنی ڕێی مزگەوتو خزمەت کردنی بە اسلامو خانەی خوای گەورەیە!!

خۆشەویستان!! گەر منداڵەکەت فێری مزگەوتو قورئانو خواپەرستی کرد هەر بەتەمەنی منداڵی ئەوە هیچ جیاوازیت نابێت لەگەڵ دایکی (مەریەم) کە پەیمانی دا کەوا منداڵەکەی ناو سکی بکاتە خزمەت کاری ماڵی خوای گەورە.

بەڕێزان دڵنیا بن لەوە کە چەندە تەمەنتان درێژ بێت هەردەبێت بمرنو بچنە ناو گۆڕەوە گەر خوای گەورە بیکاتە نسیبمان، وەهەمووڵایەکیش ئەزانین کەوا مرۆڤ دوای مردن دەپچڕێت لە ئەنجام دانی هەموو کارێکی خێر چونکە لە کێڵگەی دنیا بڕاوەو تازە توانای چاندنی تۆوی چاکەی نەماوە.

بەڵام لێرەدا تەنها هۆکارێك ماوە بۆ مەبەستی گەیاندنی خێر بە تۆی باوك، دایك، بەخێوکەرو پەروەردەکەری ئەو منداڵە کە ئەویش بریتی‌یە لە باش پەروەردە کردن‌و چاك ئامۆژگاری کردنی ئەو منداڵەی لەبەردەستت دا بووەو لەسەر بناغەی یەك خواناسی‌و سەرجەم بەها ڕەوشتی‌یەکان پەروەردەت کردووەو بەنیەتی چاکی خۆت کردووتەتە خزمەت کاری بەرنامەو ماڵی خوای گەورە.

کەواتە ئەی باوکان‌و دایکانی خۆشەویست گەر ئەتانەوێ ژیانی دنیاو پاشان ناو گۆڕتان ڕووناك بێت‌و بەرەکەت‌و ڕەحمەت ی خوای گەورەی لێ ببباریێ ئەوە باش ئاگاداری پەروەردەکردنی کۆرپەکەتان بن‌و ڕۆژانە زیاتر ڕەوشتە اسلامیەکانی فێربکەو گەرم تر بە لەسەر ئاشنا کردنی بە شارێگەی ڕزگاربوونی مرۆڤەکان لە دنیاو دواڕۆژداو کە -اسلام- ە و پاشان زۆر چاودێری بکە لەتەمەنی هەرزەکاریدا تا شەیتان‌و نەفسی بەدکاری خۆی‌و ڕەفیقی خراپ‌و ڕەوشتە دزێوو ناپەسەندەکانی ناو کۆمەڵگا فریوی نەدەن‌و لە ڕێ ی یەکخوا ناسی لای نەدەن.

بەڕاستی خۆش بەختی‌و سەرفرازی بۆ ئەو دایك‌و باوکانەی کە هەروەك دایکی (مەریەم) ئاسا منداڵەکانیان دەکەنە قوربانی‌و خزمەت کاری اسلام‌و ماڵی خوای گەورەو بەرزکردنەوەی ئالای یەکتاپەرستی کە ناوی (لااله الا الله) یە، بە پێچەوانەشەوە خەسارەت مەندی دنیاو دواڕۆژ بۆ ئەو دایك‌و باوکانەی کە منداڵ‌و جگەرگۆشەکانیان بەشێوەیەکی نادروست‌و دوور لە پەروەردی اسلامی پەروەردە دەکەن‌و فێری هەموو ئەو شتانەیان دەکەن کە دور لە یاسای اسلامەو وە خوای گەورە پێیان ڕازی نیە.

٣- هەر لە چوارچێوەی پەروەردەی منداڵ‌و دڵسۆزی باوك‌و دایك بۆ نەوەکانیان خاڵێکی تر بەدی دەکەین لە دایکی (مەریەم) ەوە بەرامبەر بە (مەریەم) ئەویش لەکاتێکدا داوای کرد لە پەروەردگاری‌و فەرمووی:

﴿واني أعيذ ها بك وذريتها من الشيطان الرجيم﴾ (ال عمران:٣٦).

واتە: ئەی پەروەردگارم من بۆ (مەریەم) و نەوەکانی دوای ئەویش پەنا دەگرم بە تۆ لە شەیتانی‌نەفرین لێکراو.

بەڕاستی ئەم حاڵەتەش یەکێکی ترە لە سۆزو خۆشەویستی‌و دڵسۆزی دایك لە بەرامبەر جگەرگۆشەکەیدا کەداوا لە پەروەردگاری بکات بەوەی کە کۆرپەو جگەرگۆشەکەی بپارێزێت لە پیلانەکانی شەیتان، هەربۆ ئەم مەبەستەیە کە پێغەمبەر

(ﷺ) فەرمان دەکات بە ژن و مێرد لەکاتی بەیەك گەیشتنیاندا بۆ ئەنجام دانی کاری شەرعی کە ئەم دووعایە بخوێنن و بڵێن:

((بسم الله، اللهم جنبنا الشيطان، وجنب الشيطان مارزقتنا)) (متفق عليه).

واتە: بەناوی خوا، ئەی پەروەردگارم لە شەیتانمان دوور بخەرەوە، هەروەها ئەو ڕۆزیەی کە دەشمان دەیتێ -کە بریتی‌یە لە منداڵ- لە شەیتانی دوور بخەرەوە.

٤- کاتێ دایکی (مەریەم) مەریەمی بوو فەرمووی ﴿ رب انى وضعتها أنثى[١]﴾ (ال عمران:٣٦).

پاشان خوای گەورە بە دوای ئەم ڕاستیەدا ڕاستیەکی تر باس دەکات و دەفەرمێ:

﴿ وليس الذكر كالأنثى﴾ (ال عمران:٣٦).

واتە: هەرگیز نێر وەك مێینە نیە، بەڵێ ئەم هەواڵە قورئانیە یەکێکە لەو ڕاستیانەی کە لەگەڵ ناخ و فطرەت و دەروون و خوێنی مرۆڤەکاندا تێکەڵ بووەو هیچ کەسێکی ژیر ناتوانێت نکوڵی لێ بکات، چونکە تەنها بە سەیر کردنێکی خێرایی هەردوو توخم و ڕەگەزی (نێرینە و مێینە) ئەم ڕاستیەت بۆ دەردەکەوێت و بواری ئەوەت نامێنێ کە بەرپەرچی ئەم ڕاستیە بدەیتەوە،گومانی تێدا نیە کە جیاوازی لەنێوان (نێرو مێ) دا تەنها خۆی لە لایەنی ماددیدا نابینێتەوە، یان تەنها لە لایەنی مەعنەویدا بەدی ناکرێ بەڵکو جیاوازی نێوان (نێرو مێ) لە هەردوو لایەنی (ماددی و مەعنەوی) دا بەدی دەکرێت کە شیاوی ووتنە لایەنە ماددیەکان دیارن هەر لە شێوازی قسەکردن و ڕۆیشتن و چۆنیەتی هەڵکەوتنی جەستەی هەرلایەك و بوونی هەندێ شتی زیادە لە هەریەکەیانداو نەبوونی هەندێ شتی تر بەڵگەی پتەون لەسەر ئەم ڕاستیە، پاشان لایەنی مەعنەویش بێ بەش نیە لەم جیاوازیە کە ئەویش خۆی لە چەند ڕاستیەکدا دەبینێتەوە هەرلە لایەنی بەهێزی و زیادە ووزە پیاوان و زاڵ بوونی لایەنی سۆزو عاتیفەی ئافرەتان و دەیان و سەدان خاڵی تری لەم جۆرە شاهیدن لەسەر ئەم جیاوازیە.

وەنەبێ ئەم جیاوازیە لە نێوان (نێرو مێ) دا کارێکی ناپەسەندو کەم و کوڕی بێت بۆ ئەو توخم و ڕەگەزە جا نێر بێت یان مێ، بەڵکو ئەم جیاوازیانە یەکێکن لە هەزارەها حکمەتی پەروەردگارو بەڵگەن لەسەر ویست و دەسەڵاتی هەروەك دەفەرمێت:

﴿يخلق الله ما يشاء﴾ واتە: ئەوەی خوای گەورە ویستی لەسەر بیت بەدی دەهێنێت و دروستی دەکات لە نەبونەوە.

لادان و پشت هەڵکردن لەم بەها مرۆڤیانە مانای هەڵبژاردنی ژیانێکی ئاژەڵی و دوور لە انسانی دەگەیەنێت، چونکە انکاری کردنە لەسەر ڕاستیەك کە زۆر بە ئاشکرا خەڵکی دەی بینێت و نزیك ترین ڕێگەش بۆ گەیشتن بەم ڕاتسیە بریتی یە لە بەراوردکردنی خۆت لەگەڵ توخم و ڕەگەزە جیاوازەکەی بەرامبەرتدا، بەڵام بەهەرحاڵ خۆ دەبێت شەیتانی نەفرین لێکراو زۆرێك لە خەڵکی سەر زەوی لە دینی خوای گەورە دوربخاتەوەو ڕاستیەکانیان بەشێوەیەکی خوار نیشان بدات و ناهەق و ناڕەوایان لە ڕێنەی حەقدا بخاتە بەرچاو و گومڕایان بکات و وەسوەسەی ئەوە لە دڵیاندا دروست بکات کە انکاری لەم ڕاستیە بکەن و پڕبەدەنگیان هاوار بکەن و سەدان دروشمی درۆینەو بریقەداری بێ ناوەرۆك بەرز بکەنەوەو بڵێن:

((باوی کۆنەپەرستی نەماو ڕۆژی بەرەوپێش چوونەو پێویستە کەوا ژن و پیاو!! شان بەشانی یەکتری هەوڵ بدەن و کارەکانی ڕۆژانەیان بکەنە دوو بەشی یەکسانەوەو هەریەك لە ئاستی خۆیەوە بەئەنجامی بگەیەنێت!! چونکە بە دڵنیاییەوە هاوار دەکەین و دەڵێین:

ئەی ئەو کەسانەی دەنگمان پێتان دەگات و دەنگتان دەمان گاتێ، باش بزانن و دڵنیا بن لەوەی کە ئافرەت و پیاو -واتە توخمی (نێرو مێ) بە هیچ شێوەیەك جیاوازی ماددی و مەعنەوی نیە لە نێوانیانداو هەردوولا وەك یەك وەهان.

پاشان هەر کەسێك گومانی هەبێت لەوەی کە (ژن و پیاو) یان (نێرو مێ) جیاوازیان هەیە ئەوە بەدڵنیاییەوە پێی دەڵێین کە شوێن کۆنەپەرستی و بۆ دواوە گەڕانەوە کەوتووەو لەچەرخە بەردینەکاندا دەژی و ئاگاداری واقع و ڕەوتی بەرەو پێش چوونی دنیاو زانستی نوێی ئەمڕۆ نیە))!!

خۆشەویستان ڕۆژانەو بەردەوام دەیان و سەدان دروشم و لافتەی ئاوا بریقەدارو بێ ناوەرۆك بەرچاومان دەکەوێت، لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ کەسی دوور لە واقع و کەم هەست و ژێری فرۆش و دنیا پەرست و دور لە خوا پێی هەڵدەخەڵەتێن و بە کوێرانە بەڵێ بۆ خاوەنی ئەم دروشمە شەیتانیانە دەکەن و ژێری خۆیان دەدەنە دەست چەند کەسانێکی بەدکارو پاشان بەژێری ئەوان بیر دەکەنەوەو بەچاوی ئەوان دەبینن و بە پێوانەی ئەوان ی دور لە خوا سەرجەم هەواڵ و ڕووداوەکان پێوانە دەکەن و هەڵدەسەنگێنن!!

بەڕاستی خەسارەت مەندیە بۆ مرۆڤەکان کە ژێری خۆیان لەدەست بدەن‌و دژی‌ڕاستیەکان بووەستن‌و پشت لەو هەواڵ‌و ڕوداوانە بکەن کەکەس ناتوانێت انکاری لە ڕاستێتی‌یان بکات‌و بەدرۆیان بخاتەوە.

٥- کاتێ (زەکەریا) دەچوو خواردن بۆ مریم ببات لە (میحراب) ەکەیدا دیمەنێکی سەرسوڕهێنەری بەدی دەکرد، ئەویش بریتی بوو لەوەی کە خواردنی زستانەی لە ژوورەکەی مەریەم دا دەبینی گەر هاوین بوایەو وەبە پێچەوانەشەوە.

گەر لە نهێنی ئەم کارە بکۆڵینەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بڵێین:

((بەڕاستی گەورەترین‌و سەرەکی ترین نهێنی لەم ڕووداوە سەیرەدا بریتی‌یە لە خۆپاراستن لە تاوان‌و خۆ بۆ خوا یەکلاکردنەوەو دروست بوونی (تەقوا) لە دڵی مەریەم دا.

گومانی تێدا نیە کە (مەریەم) (عليها السلام) زۆر لە پەروەردگاری دەترسا و بەواتا (تەقوا) ی بۆ خوای گەورە هەبوو، هەر لەبەر ئەم خاڵە گرنگەیە کە قورئان (ڕزق‌و تەقوا) ی لە نزیك یەك باس کردووەو ڕزق‌و ڕۆزی بەندەکانی گرێ داوە لەگەڵ (تەقواو خواپەرستی) دا هەروەك دەفەرمێت:

﴿ ومن يتق الله يجعل له مخرجاً ويرزقه من حيث لايحتسب ﴾.

واتە: هەرکەسێك (تەقوا)ی خوای گەورەی هەبێت‌و لە تاوان خۆی بپارێزێت ئەوە پەروەردگاری دەرووی خێری لێ دەکاتەوەو، ڕزق‌و ڕۆزی زیاد دەکات لەو جێگاو شوێنەی کە ئەو کەسە حسابی بۆ نەکردووە.

بەڵێ ئازیزان (تەقوا)و خۆپاراستن لەتاوان بنچینەو ناوەڕۆك‌و نهێنی هەمو کارێکی خێرە، تەقوایە ڕزقت زیاد دەکات، تەقوایە خوای گەورەت لێ ڕازی دەکات، تەقوایە هۆی سەرکەوتن‌و گەیشتن بە کورسی دەسەڵات‌و فەرمان ڕەوایی، هێزی تەقوایە بە بەکارهێنانی چەند هۆکارێکی ماددی دنیایی کەم سەرت دەخات بەسەر گەورەترین‌و زل هێز ترین کۆمەڵی سەرزەویداو لەناویان دەبات.

بەرزی تەقوایە کە لە دوارۆژدا دەبێتە هۆی کردنەوەی دەرگاکانی بەهەشت لێت‌و لە دۆزەخ ڕزگارت دەکات.

بەڵێ (تەقوا) بوو کە ڕزقی زستانەو هاوینەی هەڵدەدایە ناو ئەو جێگایەی کە (مریم) پەروەردگاری تێدا دەپەرست‌و عبادەتی تێدا دەکرد.

﴿كلما دخل عليها زكريا المحراب وجد عندها رزقا , قال يا مريم أنى لك هـــذا قالت هو من عند الله...﴾ (ال عمران:٣٧).

٦- مژدەی فریشتەکان لەلایەن خوای گەورەوە بۆ (مەریەم) گەورەترین خاڵی وەرچەرخان بوو لە مێژووی مرۆڤایەتیدا کە لە لایەن پەروەردگارەوە وەك خەڵاتێکی ئاسمانی بەنرخ پێشکەش بە ئافرەتان کرا.

بەڵێ هەر لەو کاتانەی کە خوای گەورە ئەو ڕێزەی لە ئافرەتان بەگشتی و (مەریەم) بەتایبەتی دەنا، لەووڵاتانی جیهانداو بەتایبەتی لە (هندستان) دا ئافرەتان ئەوەندە بێ ڕێزو کەم نرخ بوون لەسەر مێزی قومارخانەکان لەلایەن پیاوەکانیانەوە دەدۆڕێنران، کە هەروەك (أبو الحسن الندوي له کتێبی (ماذا اخسر العالم بانحطاط المسلمين) دا دەفەرمێت:

(وكان الرجل يخسر امراته في القمار).[١٠]

واتە: پیاوی وەها هەبوو کە ژنەکەی لە قوماردا دەدۆڕاند؟!!؟

بەڵێ تایبەت مەندێتی و سروشتی دینی خوای گەورە لەسەر زەویدا بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی وەها بووە کە ڕێزی تایبەتی لە ئافرەتان گرتووەو بە نیوەی کۆمەڵی زانیون، نەك ئافرەتانی بەبێ ڕێزو کەم ماف حساب کردبێت و وەك دروست کراوێکی مل کەچ بۆ پیاو ناوی بردبێت !!

خوای گەورە لە قورئاندا بەشێوەیەکی تایبەتی و زۆر بە ڕێزەوە ناوی ئافرەتانی بردووەو کردوونی بە پێشەنگ و پێشەوا بۆ سەرجەم ئافرەتانی جیهان کە هەمان ڕێبازی ئەوان بگرنەوەو لێی لانەدەن و شوێنی ڕێگا شەیتانیەکانیان نەکەون و بە پڕوپاگەندەو قسەی بیرقەدارو بێ ناوەرۆکی دوژمنانیان هەڵنەخەڵەتێن، بەڵام مەخابن!! ئافرەتان بەهۆی پشت هەڵکردنیان لە قورئان و لەدەست دان و لەبیرچوونەوەی ئەو ئافرەتە داوێن پاك و ڕەوشت بەرزانەی کە خوای گەورە لە قورئاندا بە نموونەی پێشەنگ و پێشەوایی باسی کردبوون زیان و زەرەرێکی زۆر گەورەیان لێ کەوت و ئەو ڕێزو مافەی کە لە لایەن خوای گەورەوە بۆیان دیاری کرابوو لەدەستیان داوو لەبەرامبەر ئەمەشدا هەڵسان بە دیاریکردنی پێشەنگ و پێشەوای بەدکارو داوێن پیس و خراپەکارو سەماکەر لەووڵاتانی ڕۆژئاوادا، تاکار گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە بە تەواوی ماف و ڕێزیان لەدەست بدەن و وەك ئاژەڵ لەناو کۆمەڵگای مرۆڤەکاندا بژین و لەلایەن جورلە کەو دوژمنانی خوای گەورەوە ڕووت و بێ پۆشاك بکرێن و بەرگی شەرەف لەبەریاندا دابڕنێن و بکرێتە ئالەتی بزواندنی ئارەزووی گەنجان لە شەقام و جێگا گشتی یەکان. ئافرەتان بەم دوور لە دینی و پشت هەڵکردنەیان وەك وتمان ڕێزو مافی خۆی لەدەست دا، لەپاشاندا وا تێگەیەنران کە بە

---

(١٠) ماذا اخسر العالم بانحطاط المسلمين (ص: ٥١).

هۆی اسلامەوەیەو پێویستە کەوا دژی اسلام قسە بکاتو دین بە کۆنە پەرستیو دواکەوتن بزانیو وا هەست بکات کە مافی ئەم -وەك ئافرەتێك- لەلایەن اسلامەوە خوراوەو پێویستە کەوا دژی بوەستێو هەوڵی لەناوبردنی بدرێت!!

*بەڵام لە ڕاستیدا ئەمانەی باسکران زۆر بەپێچەوانەوەنو بەو شێوەیە نین، ئافرەتان کاتێ ڕێزیان لەدەست دا کە:*

١- پشتیان کردە ئیسلامو دژی وەستان.

٢- پێشەنگو پێشەوایانی خۆیان لەبیرکردوو ئافرەتانی داوێن خراپی وڵاتانی ڕۆژئاوایان کردە مامۆستاو فێرکەری خۆیان.

٣- بەرگی شەرەفی اسلامییان فڕێ داو لەپاشان بەرگێکی تەسكو کورتو ڕوونیان لەبەرکردو بەم کارەیان بوونە سەرمەشقی خراپەو فەساد بەرپاکردن لەسەرزەویدا.

بەڵێ ئەمانەو دەیان خاڵی تری لەم بابەتە بوونە هۆکاری دابەزینی کەسایەتی ئافرەتانو لەدەست دانی مافو ڕێزیان.

کەواتە: ئەی ئافرەتی بەڕێز گەر دەتەوێ ڕێزدارو بەنرخ بیتو سەرجەم مافەکانت پارێزراو بن ئەوە (مەریەم) ی دایکی عیساو سەرجەم خێزانەکانی پێغەمبەرو سەدان ئافرەتی تری وەك ئەوان بکەرە پێشەنگو مامۆستای خۆتو لەسەر ڕەوتی ئەوان کاروانی ژیانت بەرێ بکەو بەقسەی زلو بریقەدارو بێ ناوەرۆکی ئەوانە سەرگەردان مەبە کە هەوڵی دوور خستنەوەی تۆ دەدەن لە بەرنامەی بێگەردوو گەورەی اسلام.

٧- کاتێ فریشتەکان هاتنە لای (مەریەم) سێ ئامۆژگاریان کرد کە بریتی بوون لە:

ا) ﴿اقـنـتي لربـك﴾ واتە: زۆر بە اخلاصەوە پەروەردگارت بپەرستەو بەتەواوی گوێڕایەڵی بکە.

لە ژیانی دنیای خۆماندا گەر کەسێ دیاریەك ببات بۆ کەسێکی خۆشەویستی ئەوە هەوڵ دەدات کە بەنرخترینو جوانترینو بەهادارترین دیاری بۆ بەرێت، بەڵێ هەر لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین بڵێین:

((مەریەم خۆشەویستی خوای گەورە بوو، لەم کاتەدا خوای گەورە ویستی وەهابوو کە خەڵاتێکی زۆر گەورەو گران بەها وەك دیارییەك پێشکەش بە (مەریەم) بکات، بەڵام دەبێت لەوە ئاگادار بیت خەڵاتەکەی خوای گەورە شتی ماددی نەبوو!! وەك خەڵاتە دنیاییەکان، بەڵکو چەند خەڵاتێك بوو کە هیچ کەسێ لە تواناو دەستەڵاتیدا نیە کە خەڵاتی ئاوا بەهیچ کەسێ بات کە بەردەوام لێی بخورێتو ڕۆژبەڕۆژ بەرەو زیاد بوون

بڕوان، بەڵێ ئەو خەلاتەی کە پێشکەشی (مەریەم) کرا ئەوە بوو کە خوای گەورە ئامۆژگاری (مەریەم) ی کردوو پێی فەرموو:

((ئەی مەریەم بەپاکی و دڵسۆزیەوە من بپەرستەو بەردەوام منت لە یاد بێت و لەسەرجەم فەرمانەکاندا گوێ ڕایەڵی تەواوم -واتە خوای گەورە- بکەو پاشان بەئەنجامیان بگەیەنە.

بەڕاستی گوێڕایەڵی‌کردنی خوای گەورە تەنها خۆی لە ئەنجام دانی چەند کارێکی بەرچاودا نابینێتەوە، وەك (نوێژو ڕۆژوو......)).

بەڵکو گوێڕایەڵی کردنی خوای گەورە زۆر لەوە گەورەترو فراوان ترە کە مرۆڤەکان بە ژێری سنورداری خۆیان حسابیان بۆ کردووە.

بەڵێ گوێڕایەڵی کردنی خوای گەورە بریتی‌یە لە بەئەنجام گەیاندنی سەرجەم فەرمانەکانی لەبەدەستخستنی حەلاڵ و بانگەوازی کردنی خەڵکی بۆ اسلام و جەنگ و جیهاد کردن لە پێناویداو بەخشینی نەفس و ماڵی خۆت لەکاتی پێویست و دیاری‌کراوداو خۆ بە دور گرتن لەسەرجەم ئەو ڕێگا شەیتانیانەی کە مرۆڤەکان چارەڕەش دەکەن و بەرودۆزەخیان دەبەن و لەڕەحم و سۆزی پەروەردگاریان بێ‌بەش دەکەن.

بەڵێ ئازیزان گوێڕایەڵی‌کردنی خوای گەورە ئابەم شێوە گشتی و فراوانە دەبێت وە ئەنجام چارەنوسی ئەوکەسەی کە بەتەواوی گوێڕایەڵی خوای گەورەی کردووە بریتی‌یە لە ڕازی بوونی خوای گەورە لەو کەسە لە دنیاداوە پاشان پێ‌بەخشینی بەهەشت لە دواڕۆژدا، هەروەها لەبەر ئەم خاڵە گرنگە بوو کە یەکەم ئامۆژگاری فریشتەکان بۆ (مەریەم) بریتی بوو لەوەی کە بەدڵسۆزی پەروەردگاری بپەرستی و پاشان بەردەوام لە گوێڕایەڵی‌دا بێت لەبەئەنجام گەیاندنی چاکەو نەکردنی تاواندا.

ب) ﴿واسجدي﴾: واتە: ئەی مەریەم کڕنوش ببە بۆ پەروەردگارت و ناچاوانی پاکت بخەرە سەر زەوی و ببە بەیەکێ لە کڕنوش بەران (کونوا مع الساجدين) بێ‌گومان یەکێکی تر لەو ئامۆژگاریانەی کە فریشتەکان وەك خەلاتێك بەخشیان بە مەریەم بریتی بوو لەوەی کە ئاگاداریان کردووە کڕنوش زۆر ببات بۆ پەروەردگاری.

بەڵێ سەرەکی ترین خاڵێك بۆ نزیك بوونەوەی بەندە لە پەروەردگاری بریتی‌یە لە کاتی کڕنوش بردن هەروەك پێغەمبەر دەفەرمێت:

((اقرب ما يكون العبد من ربه وهو ساجد فاكثر الدعاء)) (رواه مسلم).

واتە: نزیکترین شوێنێك کە بەندە لە پەروەردگاریەوە نزیك بێت بریتی‌یە لە کاتی کڕنوشبردن، کەواتە زۆر دووعای‌تێدا بکەن.

گومانیشی تێدا نیە کە ئەو ناوچاوە چاکانەی کە کڕنوش بۆ پەروەردگاریان دەبەن لە ڕۆژی قیامەتدا هەرگیز ئاگری دۆزەخ نایان سوتێنێ‌و سەلامەت دەبن لە ئاگر، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) لە فەضل‌و گەورەیی کڕنوشبردن (سجود) بۆ خوای گەورەدا دەفەرمێت:

((من كان يعبد الله فيخرجونهم ويعرفونهم بآثار السجود وحرم الله على النار ان تاكل اثر السجود فيخرجون من النار فكل ابن ادم تاكله النار الا اثر السجود..))

(رواه البخاري، باب فضل السجود) ج(٢)/ (ص: ٣٨١).

واتە: لەڕۆژی دوایدا هەرکەسێك عیبادەتی خوای گەورەی کردبێت ئەوە لەناو خەڵکیدا دەردەهێنرێن‌و جیا دەکرێنەوەو پاشان دەناسرێنەوە بە شوێنی سوجدەکانیاندا، وە خوای گەورە حەرامی دەکات لەسەر ئاگر کە شوێنەواری ئەو سوجدەیە -کە ناوچاوانە- بسوتێنێ‌و بیخوات، لەپاشاندا ئەو کەسانەی کە خاوەنی (سجد) مکەبوون لە دۆزەخ دەردەهێنرێن وە هەموو بەنی ئادەمێك ئاگر دەیسوتێنێ لەناو دۆزەخدا گەر ئەهلی دۆزەخ بێت تەنها ناوچاوان‌و شوێنەواری ئەو (سجدة) یە نەبێت!!.

بەڵێ خۆشەویستان هەر لەبەر گەورەیی (سجدە)و کڕنوشبردن بوو کەوا فریشتەکان لەلایەن خوای گەورەوە مژدەو خەڵاتی پێشکەش بە (مەریەم) کردوو پێیان فەرموو: ﴿واسجدي﴾.

ج) ﴿واركعي مع الراكعين﴾ :واتە: ئەی مەریەم رکوع ببە لەگەڵ رکوع بەراندا.

سێهەمین ئامۆژگاری فریشتەکان بۆ (مەریەم) بریتی بوو لەوەی کە فەرمانیان پێ‌کرد کە رکوع ببیات بۆ پەروەردگاری‌و زەلیلی‌و بێ دەستەڵاتی خۆی بنوێنێ لەبەردەم پەروەردگاریدا.

پەندو سودیکی تر کە لە (واركع مع الراكعين) وەری بگرین بریتی‌یە لەوەی کە خوای گەورە بەعەمەلی فێرمان دەکات‌و تێمان دەگەیەنێت‌و پێمان دەفەرمێت:

((ئەی بەندەکانم رکوع بردن بۆ من کارێکە زۆر گەورەیەو بەهۆیەوە لێتان ڕازی دەبمو لەسزای دۆزەخ ڕزگارتان دەکەمو پاشان بەنازونعمەتەکانی بەهەشتان دەسپێرم، بەڵام دەبێت زۆر باش ئاگادار بن لەوەی کە تەنها (رکوع) بردن کۆتایی بە فەرمانەکەی من -واتە خوای گەورە- ناهێنێت‌و مەسەلەکە لێرەدا تەواو نابێت، بەڵکو دەبێت بەکۆمەڵ (الجماعة) (رکوع) م بۆ بەرن‌و زۆربەی کارەکانتان بەکۆمەڵ بێت هەروەك:

((نوێـژ - ڕۆژوو - حـەج - جـهاد - بانگـەوازکردن و گـەیاندنی دینـی خـواو - وەستان لەیەك ڕیزدا بۆبەرگری کردنتان لە اسلام و ڕووبەڕووبوونەوەتان لەبەرامبەر بە دوژمنان..هتد)).

٨- گەرەترین پەندێك کە لە ڕووداوی لەدایك بوونی (عیسا) وە (عليه السلام) وەری بگرین بریتی یە لەشارەزابوون و ئاگادار بوون لە دەستەلاتی بێسنوری خوای گەورە.

گەر هەموو خەلکی سەرزەوی کۆبکەینەوەو ڕاپرسیەکیان پێ بکەین لە دەربارەی لەدایك بوونی مرۆڤەوە ئەوە لەوەلامدا پێت دەلێن:

((هاتنە دنیای مرۆڤەکان بەهۆی بەیەك گەیشتنی ژن و پیاوە جا بەیەك گەیشتنەکەیان شەرعی بێت یان ناشەرعی (دروست یان نادروست)).

بەلێ خەلکی سەرەکی ترین هۆکاری پەیدابوونی مرۆڤ بەم هۆکارە دەزانێت بەلام ئالێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت!!؟

((ئایا ئەوەی مرۆڤەکان بیری لێ دەکەنەوە لەلای خوای گەورەش هەمان شتە؟!

((ئایا ئەو ئەنجام و چارەنوسەی مرۆڤەکان بۆ کارو ڕووداوەکانی دادەنێن لەلای پەروەردگار هەمان ئەنجام و چارەنوسە؟!)).

((ئایا ئەوەی مرۆڤەکان بە ژێری سنورداری خۆیان بەهۆکاری دروست بوونی مندالی دەدانێن کە بریتی یە لە (باوك و دایك) ئایا لەلای خوای گەورەش پەیدابوونی مرۆڤەکان تەنها بەم ڕێگەیەیە یان ڕێگەی تریشی هەیە؟!!؟.

لەوەلامدا دەلێین: پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە کە لە سیفەت و کارەکانیدا لەبەندەکانی بچێت چونکە خۆی دەفەرمێت:

﴿ ليس كمثله شيء ﴾ . پاشان دەبێت لەوە دلنیا بین کە ئەوەی مرۆڤەکان زۆرجار حسابی بۆ دەکەن و بەهۆکاری ڕودان و ڕونەدانی ئەو کارانەی دادەنێن لەلای خوای گەورە بەتالە و خوای گەورە نەخشەو بەرنامەیەکی تری بۆ ئەم ڕودان یان ڕونەدانانە داناوە.

گومانی تێدا نیە کە هاتنە دنیای (عیسا) (عليه السلام) یەکێکە لەو ڕوداوە گرنگانەی دەبێت بەئاشکرا دەستەلاتی بێسنوری خوای گەورەی تێدا دەربکەوێت چ بۆ خەلکی ئەو سەردەمەو چ بۆ خەلکانی دوای ئەویش تاڕۆژی دوایی!!.

بەلێ لەدایك بوونی عیسا (عليه السلام) سەرەتایەك بوو بۆ دلنەوایی دانەوەی (مەریەم) کە دل گران نەبێت و خەم و خەفەت نەخوات و نەترسێت لەوەی کە خەلکی بوختانی بۆ دروست بکەن و بە داوێن پیس لەقەلەمی بدەن.

٩- یەکێکی تر لەو یاسا گرنگانەی کە لە ڕوداوی لەدایك بوون و هاتنە دنیای (عیسا) وە وەری بگرین بریتی یە لەوە کە خوای گەورە تەنها بەیەك شێوە مرۆڤەکان لە نەبوونەوە ناهێنێتە سەر شانۆی ژیان *بەڵکو چەند شێوەیەکی تری هەیە، کە بریتین لە:*

ا- دروست بوونی مرۆڤەکان بەبێ دایك و باوك هەروەك (ئادەم) (عليه السلام).

ب- دروست بونی مرۆڤەکان بەبێ باوك هەروەك (عیسا) (عليه السلام).

ج- دروست بوونی مرۆڤەکان بە هۆی دایك و باوکەوە.

د- دروست بوونی حەوا لە ئادەم ﴿وخلق منها زوجها﴾.

خوای گەورەش لەبارەی دروست کردنی مرۆڤەکانەوە دەفەرمێت:

﴿ كذلك الله يخلق ما يشاء.. ﴾ (ال عمران:٤٧).

١٠- یەکێکی تر لەو یاسا گرنگانەی کە لە ڕوداوی لەدایك بوونی (عیسا) وە وەری بگرین بریتی یە لە بڕیاردانی خوای گەورە بەسەر کارێکدا کەهەر دەبێت ببێت و گەڕانەوەو دواکەوتنی بۆ نیە، هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿ اذا قضى أمراً فإنما يقول له كن فيكون ﴾ (ال عمران:٤٧).

واتە: کاتێ خوای گەورە بڕیاری کارێکیدا هەر ئەوەندە پێی بڵێ ببە ئەوە دەبێت.

یان دەفەرمێت:

﴿ وكان أمراً مقضيا ﴾ (مريم:٢١).

واتە: جبرەئیل (عليه السلام) بەمەریەمی فەرموو پەروەردگارت ویستی وەهایە کە دەبێت تۆ –منداڵت- ببێت وە ئەمەش فەرمانێکە لەلایەن خوای گەورە فەرمانی لەسەردراوەو حوکمەکەی بڕاوەتەوە.

یەکێك لەیاسا نەگۆڕەکانی خوای گەورە بریتیی لەوەی کە کاتێك فەرمان دەدات بەسەر بوون یان نەبوونی کارێکدا ئەوە دەبێت بێتە جێ و لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێکیش ناتوانرێ بکرێتە بەربەست لەبەردەم بەئەنجام گەیاندنی ئەو فەرمانە خواییەدا.

بەڵێ گەر هەندێ بەژیری خۆشمان بیر لە فەرمانەکانی خوای گەورە بکەینەوە ئەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بڵێین:

۞ ئاخۆ چ کەس و لایەن و دەستەڵاتێك هەبێت کە لە هێزو دەستەڵاتی خوای گەورە بالادەست تر بێت تاکار لە فەرمانەکانی پەروەردگار بکات و نەهێڵێت بە ئەنجام بکات؟!

۞ ئاخۆ دەبێت چ هێزو دەسەڵاتێکی دنیایی بەرگەی بچوکترین هێزی خوای گەورە بگرێت؟!

۞ مرۆڤەکان ویستیان هەیەو خوای گەورەش ویستی هەیە!! بەڵام ویستی مرۆڤەکان لەژێر ویستی خوای گەورەدان‌و فەرمانەکانی خوای گەورە زاڵە بەسەر فەرمانەکانی بەندەکانیدا نەك بە پێچەوانەوە:

﴿ وما تشاؤن إلاّ أن يشاء الله ﴾.

۞ ئەوەی مرۆڤەکان بیانەوێت ئەنجامی بدەن هەمووکات ناتوانن بەئەنجامی بگەیەنن بەڵام ئەوەی خوای گەورە فەرمانی لەسەر دابێت‌و ویستی بەئەنجام گەیاندنی هەبێت ئەوە دەبێت بەئەنجام بگات‌و دوا نەکەوێت:

﴿ فعال لما يريد﴾.

**١١**- لە کاتێکدا مریم (عیسا) ی بوو (عليه السلام) دەست بەجێ (عیسا) هاتە قسەکردن‌و ئامۆژگاری دایکی کرد بەوەی کە دەست بداتە پەلی دار خورمایەك‌و ڕای‌بوەشێنێ بۆ ئەوەبەستەی (خورما) بکەوێتە خوارەوە.

بەڵێ خواردنی شیرینی لەکاتی منداڵ بووندا باشترین خۆراکە بۆ ئافرەتێك کە تازە منداڵی بووبێت، قورئان (١٤٠٠) ساڵ زیاتر لەمەوپێش باسی ئەم ڕاستیە زانستیەی لە گێرانەوەی چیرۆکی یەکێك لە پێغەمبەران باس کردووە!! بەڵام زانستی تازەی ئەمڕۆ بەبەکارهێنانی دەیان‌و سەدان ئامێری پزیشکی‌و پێشکەوتووی متمانەپێکراوو دەگەنە ئەو ڕاستیە زانتسیەی کە بڵێن شیرینی، بەتایبەتی خورما!! باشترین خۆراکە بۆ ئافرەتێك کە تازە منداڵی بووبێت چونکە:

**أ**) دۆزراوەتەوە کە خورما -بەتایبەتی ماددەیەکی تێدایە کە دەبێتە هۆکاری بتەوبون‌و بەهێزکردنی ماسولکەکانی (ڕەحم) ی ئافرەت چ لە کاتی پێش منداڵ بوون، وەلەکاتی دوای منداڵ بوونیش دەبێتە هۆکاری کەم کردنەوەی (نەزیفی خوێنی ئەو ئافرەتە).

**ب**) (خورما) جۆرە شیرینی‌و شەکرێکی تێدایە کە زۆر ئاسان هەرس دەکرێت‌و لەلایەن مەمیلەکانەوە دەمژرێت بۆ نموونە: وەك (شەکری -کلیکۆز- گومانیشی تێدا نیە کە ئەم جۆرە شرینیانە سەرچاوەی ووزەی بنەڕەتی لەشی مرۆڤن).

ج) یەكێكی تر لەلایەنە باشەكانی —خورما- ئەوەیە كە پاڵەپەستۆی خوێن (ضغط الدم) ی لەشی ئافرەت دادەبەزێنێ لەكاتی منداڵ بووندا[11].

﴿وهزي اليك بجذع النخلة تساقط عليك رطباً جنياً﴾ (مريم:٢٥).

١٢- یەكێ لە هەڵە گەورەو بەرچاوەكانی ئینسان بەشێوەیەكی بەردەوام بە درێژایی مێژوو بریتی بووە لە حوكم دان بەسەر ڕوداوەكاندا بەبێ لێكۆڵینەوەو زانست پێ بوون لە بارەیەوە.

بەڵێ كاتێ مریم (عليها السلام) گەڕایەوە بۆ ناو گەلەكەیی و عیسای بەباوەشەوە بوو دەست بەجێ گەلەكەی بەبێ ئەوەی لەم ڕوداوە بكۆڵنەوەو پرسیار بكەن لە مەریەم كە ئاخۆ ئەم منداڵەت لە كوێ بوو، ئایا هی خۆتە یان دۆزیوتە تەوە؟! ئایا هی كەسێكی تر نیە بەتۆ كەلای داناییت؟!

ئەم گەلە بەدكارە چونكە دورن لە دینی خوای گەورەو هیدایەتی پەروەردگارو پەیامی ئاسمانی، ئەوە دەست بەجێ خراپ ترین قسە بۆ تەفسیر كردنی ئەم ڕوداوە دەكەن كە ئەویش بریتی‌یە لە هەڵبەستنی تاوانی داوێن پیسی بۆ مەریەم (عليها السلام).

بەڕاستی تاوانێكی زۆر گەورەیە بەلای خوای گەورەوە كە مرۆڤەكان هەر لەخۆو بەبێ زانستو زانیاری قسە بكەن‌و حوكم بدەن بەسەر ڕوداوو مەسەلەكاندا، هەرلەبەر ئەم خاڵەیە كە خوای گەورە ئامۆژگاری بەندەكانی دەكات‌و دەفەرمێت:

﴿ ولا تقف ما ليس لك به علم ان السمع والبصر والفؤاد كل اولئك كان عنه مسؤلا..﴾.

واتە: بەگومانەوەو حوكم نەدەن بەسەر شتێكدا كە زانست‌و زانیاریتان تێیدا نەبێت، بەڕاستی گوێچكەو چاوو دڵ بەشێوەیكی گشتی لەڕۆژی دوایدا لێیان دەپرسرێتەوە!! یان مرۆڤ بەتایبەتی لەوسێ ئەندامەی دەپرسرێتەوە.

پاشان حوكم دان بەسەر ڕوداوەكاندا بەبێ زانست‌و لێكۆڵینەوە سەرەنجامەكەی بە بوختان كردن‌و هەڵبەستنی دۆرو لەكەدار كردنی كەسایەتی مرۆڤەكان بەتایبەتی (ئافرەتان) تەواو دەبێت، كەئەمەش خۆی بۆ خۆی تاوانێكی گەورەیەو لە اسلامدا سزایەكی سەختی دنیاو پاشان قیامەتی بۆ دانراوە.

---

(١١) ئەم سێ خاڵەمان لە كتێبی (مع الطب في القران الكريم) وەرگرت، لاپەرە (٢٨-٢٩) لە نوسینی (د. عبد الحميد دياب) و (د. أحمد قرقوز).

خوای گەورە دەفەرمێت:

﴿ والذين يرمون المحصنات ثم لم يأتو بأ ربعة شهداء فاجلدوهم ثمـانين جلـدة ولا تقبلوا لهم شهادة أبداً وأولئك هم الفاسقون ﴾ (نور:٤).

واتە: ئەو کەسانەی کە تۆمەتی (زینا) کردن‌و داوێن پیسی دەدەنە پاڵ ئافرەتانی داوێن پاک‌و بەڕەوشت، لەپاشاندا (٤) شاهید ناهێنن لەسەر ئەو قسەی کە کردوویانە، ئەوە (٨٠) داری جەڵدیان لێبدەن‌و هەتاهەتایە شاهیدیان لێوەرمەگرن، بەڕاستی ئەوانە فاسقن‌و لەڕێی خوای گەورە دەرچوون.

١٣- کاتێ (عیسا) (عليه السلام) بەدەستی دایکیەوە هاتە قسەکردن بۆ مەبەستی وەڵام دانەوەی‌گەلەکەی دەست بەجێ‌و یەکەم هەواڵ کەدای بە گوێچکەیاندا فەرمووی:

﴿إني عبد الله﴾.

(یا سبحان الله!! یا سبحان الله..) بەڕاستی مەگەر تەنها پەروەردگاری مەزن‌و بێ هاوەڵ بتوانێت ڕاڤەی ئەم ڕوداوو قسەی (عیسا) مان بۆ بکات‌و پێمان بڵێت.

((ئەی گرۆهی ئادەمیزاد!! ئەی ئەو کەسانەی کە ئێستا وەستاون‌و عیساو مەریەم دەبینن، ئەی ئەو کەسانەی کەوا خۆتان بە شوێن کەوتەی عیسا دەزان، ئەی ئەوانەی کەوا هەموو سەری ساڵێکی تازەی (میلادی) ئاهەنگ دەگێڕن تا بەیانی‌و بەخۆشی‌و لەدایک بوونی عیساوە!!

ئەی ئەو کەسانەی کە عیسا بە خوا یان کوڕی خوا دەزانن باش گوێ بگرن‌و بزانن))

کەوا: ((عیسام بەدەستەڵاتی پەروەردگاریتی‌و گەورەیی خۆم دروست کرد، پاشان هەر بە منداڵی‌و بەدەستی دایکیەوە هێنامە قسەکردن‌و وەڵام دانەوەی گەلەکەی، وەیەکەم قسە هستمە سەر زوبانی بیڵێت بریتی بوو لەوەی کە ووتی من (بەندەی خوام) هەروەک سەرجەم بەندەکانی تر، من پەروەردگار نیم کە هەروەک هەندێکتان وا گومان دەبەن (والعیاذ باللە).

من کوڕی خوا نیم کە هەروەک کۆمەڵێکی ترتان وا دەڵێن، من بەندەی مل کەچ‌و گوێڕایەڵی پەروەردگارم‌و ئەوەی ئەو فەرمانی پێ بکات من لە خزمەتی دام‌و بەگوێی دەکەم.

ئەی گەلەکەم!! ئەی ئەو کەسانەی کەمنتان نەدیوە‌و خۆتان بە شوێن کەوتەی من دەزانی‌وپێتان دەوترێت (مەسیحی) ئاگاداربن‌و بزانن کەوا سەرەکی ترین کاری‌من لەسەر دنیادا وەک نێردراوێکی خوایی بریتی‌یە لە چەسپاندنی پاک‌و بێ‌گەردی‌و بێ هاوەڵی‌و

یەکتا پەرستی خوای گەورە لە دڵی خەڵکیدا نەك ئێوەی شوێن کەوتەم وا بزانن کەوا منیش (خوا) یان (کوڕی خوا) م (سبحانه وتعالى عما يشركون).

ڕاستیەکی بەڵگە نەویستە کەوا بڕیاردانی منداڵ بۆخوای گەورە دەبێتە هۆکاری لەناوچوون و ڕووخانی دنیا و کۆتایی ژیان هەروەك خوای گەورە دەفەرمێت:

﴿ تكاد السماوات يتفطرن منه وتنشق الأرض وتخر الجبال هدا, أن دعوا للرحمن ولداً * وما ينبغي للرحمن أن يتخذ ولداً ﴾ (مريم:٩٠-٩١).

واتە: نزیکە کەوا ئاسمانەکان لەت لەت بن و پاشان زەوی کون ببێت و شەق بەرێت و شاخەکان بڕوخێن و هاڕە بکەن، لەبەر ئەوەی بڕیاری ڕۆڵەو نەوەیان داوە بۆ پەروەردگاری میهرەبان!!؟ لە کارێکدا کە ناگونجێ و شایەنی پەروەردگار نیە کە ڕۆڵەو منداڵی هەبێت!

بەڵکو ئەوەی لەزەوی و ئاسمانەکاندا دەژی بەزیندوو مردووەوە سەرجەم بەکۆ بەندەی مل کەچ و بێ دەستەڵاتی پەروەردگارن و پاشان سەرنجام هەر بۆلای ئەو دەگەڕێنەوە، هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿ان كل من في السماوات والأرض الا اتي الرحمن عبداً﴾ (مريم:٩٣).

بەڕاستی خەسارەت مەندی و نەفامی و چارە ڕەشیە بۆ مرۆڤەکان کەوا بڕیاری منداڵ بۆ پەروەردگار بدەن و بڵێن خوا کوڕ یان کچی هەیە (والعيذ بالله من الشيطان الرجيم) لە کاتێکدا خوای گەورە خۆی‌فەرمان بکات بەبەندەکان کە بڵێن

﴿ قل هو الله أحد, الله الصمد, لم يلد, ولم يولد, ولم يكـــن لـــه كفـــواً أحـــد ﴾ (الأخلاص:١-٤).

واتە: بڵێ ئەوە خوای تاك و تەنهایە، ئەو خوایەی جێی نیاز و ئومێدی بەندەکانە، کەسی لێ نەبووە و لەکەسیش نەبووە، وەکەس هاوتا و هاو وێنەی نیە لە خوایەتی و کاری بەڕێوەبردندا.

١٤- دووەم ووتە و وەڵامی (عیسا) (عليه السلام) بەدەستی دایکیەوە لەبەردەم گەلەکەیدا بریتی بوو لەوەی کە ئەو ڕاستیەی خستە بەرچاو کە پێی فەرموون:

((ئەی گەلەکەم من لەگەڵ ئەوەی بەندەی مل کەچ و گوێڕایەڵی خوای گەورەم پەرتوکێکی ئاسمانیشم پێبەخشراوە لەلایەن پەروەردگارمەوە بەناوی (ئینجیل) ەوە، هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿ءآتني الكتاب﴾ (مريم:٣٠).

پێ‌بەخشینی پەرتوکی ئاسمانی بە (عیسا) (عليه السلام) بریتی بوو لەو ڕۆژە پرشنگدارە لە ژیانی ئەو گەلە دل ڕەق و کەم باوەڕەدا کە بوە هۆی ڕوناك کردنەوەی سەرجەم ئەو تاریکیانەی کەدەیان و سەدان ساڵ بوو تاریك و ڕەش بوون و خەڵکی حەقیقەتیانی نەدەزانی، ئەویش بەهۆی پشت هەڵکردنیان لە دینی خوای گەورە و ئامۆژگاری پێغەمبەران و هەڵبژاردنی دنیای کاتی بەسەر قیامەتی هەمیشەیدا.

بەڵێ پەروەردگاری میهرەبان لە سۆزو خۆشەویستی خۆیەوە بۆ بەندەکانی کە لە دنیا گومڕاو سەر لێ شێواو نەبن و لە ڕۆژی دوایشدا لە دوای شەیتانەوە نەچنە دۆزەخەوە عیسای وەك پێغەمبەرێکی ڕەوانە کراوو بۆ ناردن و پاشان بۆ زیاتر هۆشیار کردنەوەی ئەوگەلە دوور لە خوایە پەرتوکێکی ئاسمانیشیەناوی ئینجیلەوە پێ بەخشین، بەڵام مەخابن کەوا ئەو گەلەی خوای گەورە ویستی وەها بوو کە هیدایەت وەربگرن و بەڕاستی ببنە بەندەی پەروەردگارو لەبەندایەتی شەیتان و نەفس و ئارەزوو دنیا پەرستی ڕزگاریان ببێت هەڵسان بەدژایەتی (عیسا) و بەرنامەو ڕێبازو ئەو پەرتوکەی کە ڕێگەی هیدایەتی تێدا بوو بۆیان!! (انشاء الله) لەباسەکانی تردا بەدرێژی دەچینە خزمەت ئەم بابەتانە.

١٥- یەکێکی تر لەو خاڵە گرنگانەی کە (عیسا) (عليه السلام) وەك ڕاستیەك گەلەکەی لێ ئاگادار کردووە بریتی بوو لەوەی کە پێی فەرموون:

﴿وجعلني مباركاً أينما كنت.. ﴾ (مريم:٣١).

واتە: پەروەردگارم من دەگێڕێ بەکەسێکی پیرۆز لەهەر شوێنێك بم.

ئاخۆ دەبێت ئەو شوێنانەی کەوا ناوی خوای گەورەو پەیامەکەی و پێغەمبەرانی تێ دەچن چەند پیرۆز بن و چەندە دڵ ئارامی و ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێتە خوارەوە.

بەڕاستی پێویست بەبەڵگە باس کردن ناکات کەوا پێغەمبەران هەڵبژاردەی ناو سەرجەم بەندەکان و خوای گەورە بۆ کارێکی زۆر گەورە دەست نیشانی کردوون کە ئەویش پاکژ کردنەوەی خەڵکیە لەسەرجەم ئەو کارە دزێوو ڕەفتارە ناپەسەندانەی کە دەبنە هۆکاری ڕیسوا بوون و بێ ڕێزبوونی بەندەکانی لەدنیادا،باشە گەر کەسێ کاری سەرەکی بریتی بێت لە پاك کردنەوەی خەڵکی لەکاری خراپ و گوفتاری ناپەسەند، ئەوە دەبێت ئەوبانگخوازە چاکە کارە چەندە پیرۆزو پاك و مبارك بێت؟! پاشان ئاخۆ دەبیت ئەو جێگاو شوێنەی کەئەم وەك بانگ خوازێکی خوایی ڕووی تێدەکات چەندە پیرۆز بیت؟! بەڵێ هەر لەبەر ئەم خاڵە بوو کەوا (عیسا) (عليه السلام) فەرمووی، پەروەردگارم من دەگێڕێ بەکەسێکی پیرۆزو مبارك گەر لەهەر جێگایەکدا بم.

ئەم پیرۆزیە تەنها پەیوەست نیە بە بەندەیەکی وەك (عیسا) وە (عليه السلام) بەڵکو ئەم پیرۆزیە خەڵاتو دیاریەکی خواییەو پەیوەستە بەهەموو ئەو کەسانەوە کەهەمان رێبازو بەرنامەی پێغەمبەران دەگرنو کاروانی ژیانی خۆیان لەسەر رەوتی ئەو کەڵە پیاوانە بەرێ دەکەنو بانگی حەقی خوایی دەدەن بە گوێچکەی خەڵکیداو ئاکاری جوانی مرۆڤیو ووتەی بەنرخو کردەوەی پەسەند پەخش دەکەن لەناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا.

کەواتە ئەی بانگ خوازانو شوێن کەوتەی زنجیرە کاروانی پێغەمبەران!! مژدەتان لێ بێت کەوا گەر دەتانەوێت ئێوەش کەسێکی پیرۆزبن لەلای پەروەردگارتان ئەوە (عیساو موساو محمدو سەرجەم پێغەمبەرانی تر بکەنە پێشەواو سەر مەشقی کاری بانگەوازتانو بەهەمان رێبازی ئەواندا برۆنەوەو ئارامگربن لەسەر ئەو کۆسپو نارەحەتیانەی کەتوشتان دەبێت.

وە دڵنیاش بن کە (والعاقبة للمتقين) پاشان (والندامة للظالمين).

١٦- یەکێکی تر لە ئامۆژگاریەکانی عیسا (عليه السلام) لەبەردەم گەلەکەیدا بەوە بوو کە فەرمووی: ((پەروەرگارم فەرمانم پێ دەکات بە نوێژ کردنو زەکات دان تا زیندوو بم لە دنیادا بم)).

هەروەك دەفەرمێت:

﴿وأوصاني بالصلاة والزكاة مادمت حياً﴾. (مريم: ٣١).

گەر سەرنجی ووتەکانی (عیسا) بدەین (عليه السلام) باسی سێ لایەنی گەورە دەکات کە ئەوانیش بریتین لە.

ا)﴿أوصاني بالصلاة﴾:

واتە: پەروەرگارم فەرمانی پێکردووم بە نووێژ، گومانی تێدا نیە کەوا فەرزەکانی خوای گەورە بۆ مرۆڤەکان زۆرن بەڵام لێرەداو لەناو هەموویاندا باسی (نوێژ) کراوە بە پلەی یەکەم، ئاخۆ دەبێت نهێنی ئەم کارە چی بێت؟!

لە وەڵامدا دەڵێین:

بەراستی سەرەکی ترین هۆکارەبۆمەبەستی نزیك خستنەوەی بەندە لە پەروەوەردگاری چونکە مرۆڤ کاتێ دەست دەکات بە نوێژ کردن ئەوە لەجیهانی ماددی دەردەچێت و پەیوەندی بەجیهانیغەیری ماددەوە دەکات و رۆحی گرێ دەدات لەگەڵ ئاسمانەلائکەتەکاندا، پاشان پەیوەندی دەکات بە پەروەردگارەوەو ووتوو وێژی لەگەڵدا دەکات بەڵێ نوێژ کردنە لەسەرجەم کاری خراپ دوورت دەخاتەوە.

﴿ ان الصلاة تنهى عن الفحشاء والمنكر ﴾.

نوێژ کردنە بەرەو بەهەشتت دەبات و لە دۆزەخ دوورت دەخاتەوە.

﴿ماسلككم في سقر ؟! قالوا لم نك من المصلين!!﴾.

نوێژکردنە مایەی عیزەتی موسوڵمانان.

نوێژکردنە پێناسی کەسێك کە خۆی بە موسوڵمان بزانێ.

نوێژکردنە کە مرۆڤە موسوڵمان و بێباوەڕەکان لەیەکتری جیا دەکاتەوە هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێت:

((العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر)).

واتە: ئەو پەیمانەی لە نێوان ئێمەو کافراندا هەیە بۆ مەبەستی جیاکردنەوەمان لەیەکتری (نوێژ) ە هەر کەسێ وازی لێبهێنێت ئەوە کفری کردووەو بێ باوەڕ بووە.

ب) ﴿والزكاة﴾:

واتە: پەروەردگارم فەرمانی ئەوەی پێکردووم کەزەکاتی ماڵم بدەم، بێگومان زەکاتیش بەهەمان شێوە یەکێکی ترە لەو هۆکارە گرنگانەی کە مرۆڤەکان پاك دەکاتەوەو لە بەغیلی و حەسودی و پارەپەرستی دەیان پارێزێت.

بەڕاستی (زەکات) یەکێکە لەو خەڵاتە خواییەی کە بە دیاری پێشکەش بە هەژاران کراوەو فەرمان بە دەوڵەت دارو سەرمایەدارەکان کراوە کەزەکاتی ماڵی زیادەی خۆیان بدەن و پاکی بکەنەوە.

کە ئەمەش چارەسەری سەرجەم ئەو کێشە ئابووری و کۆمەڵایەتیانە دەکات کەلە ناو کۆمەڵگادا دووچاری مرۆڤەکان دەبێت.

زەکات دان چینی فەقیرو دەوڵەمەند دەکاتە برای یەکتری و لەدژایەتی یەکتر دوریان دەخاتەوە، کە بەداخەوە کۆمەڵێکی بێباوەڕوو دوور لە خوا بەناوی (مارکسیەت) ەوە چەند ساڵێك لەمەوبەرو پێش ڕسوابوون و نەمانیان لە دنیایواقع دا بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ئێمە (مارکسیەت) مافی چەوساوەو چینی هەژار کە بە -پرۆلیتاریا- ناسراو بوو دەسەنینەوەو خەباتی سیایی و چەکداری لە دژی سەرمایەدارو دەوڵەت دارەکان بەرپا دەکەین کە بە (الأروستقراطية) ناسراون.

لە یاسای خوای گەودا (هەژاران و سەرمایەداران) بەهۆی یاسای ئابووری زەکات دانەوە لەلایەن دەوڵەمەندانەوەو بۆ فەقیران، براو خۆشویستی یەکرتن، بەڵام لەیاسای (مارکسیەت) و سەرجەم ڕێچکە ماددی و الحادیەکانی تردا (هەژاران و سەرمایەداران) گەورەترین و سەرسەخت ترین دوژمنی یەکترن.

وەنەبێ مارکسیەکان ئەم شۆڕشە سیاسیو سەربازیەیان ڕاست بوبێتو هۆکارێکی عەمەلی بووبێت بۆ سەندنەوەی مافی هەژاران لەسەرمایەدارن؟! نەخێر؟! بەڵکو مارکسیەکان لە ڕووسیاداو لەدوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر لەساڵی (١٩١٧) کە کردیان دژی (مەسیحی) قەیصەرەکان، دەست بەجێو یەکەم چین چینی هەژار دەست کورتو بێ نەواکانیان چەوساندەوەو لەجاران زیاتر مافیان دەخواردنو هەژاریان دەخستن چونکە هیچ جوتیارێك بەپێی یاسای ئابووری اشتراکی مارکسی بۆی نەبوو کە خاونی تەنها (١) مەترە زەوی چوارگۆشە بێت؟!

بەڵام لە اسلامدا بە پێچەوانەوە ئەو کەسانەی کە مافی هەژارانیان دەخواردوو زەکاتی ماڵەکانیان دەرنەدەکردوو تەسلیمی هەژارانیان نەدەکرد ز ۆر بە توندی لەلایەن دەستەڵات دارە اسلامیەکانەوە دژایەتی دەکرانو شۆڕشی سەربازی ڕاستەقینەیان لەم دژیان بەرپا دەکرا.

ئەمەش وە نەبێ تەنها قسە بێتو لە مێژووی دەستەڵاتی اسلامدا ڕووی نەدابێ بەڵێ!! لەسەردەمی خەلافەتی (ابوبکری صدیق) دا (خوای لێ ڕازی بێت) و بەتایبەتی لەپاش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) کۆمەڵێك هەڵگەڕانەوەو بە (المرتدین) ناسران، بەشێك لە کۆمەڵی هەڵگەڕاوەکان بریتی بوون لەو کەسانەی کە زەکاتی ماڵەکانیان نەدەداو بە هەژارانو واشیان گومان دەبرد کە زەکات دان تەنها پەیوەستە بەسەردەمی پێغەمبەرەوە (ﷺ)و پاش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) زەکات نادرێت!!

لەم کاتەدا (ئەبوبەکر ی صدیق) کە چەندە دڵ نەرم بوو هەڵسا بە فەمان دانو ئامادەکردنی لەشکرێکی زۆر لە دژی ئەو کەسانەو فەرمووی:

﴿ واللہ لأقتلن من فرق بين الصلاة والزكاة.. ﴾. (تاریخ الاسلام) د. حسن ابراهیم حسین

واتە: سوێند بێت بە پەروەردگار ئەو کەسانە دەکوژم کە جیاوازی دەخەنە نێوان نوێژکردنو زەکات دانەوە.

لەم کاتەدا (عمری کوڕی خەطاب) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت:

(فوالله ماهو الا ان شرح الله صدر ابي بكر رضي الله عنه فعرفت انه الحق) (رواه البخاري).

واتە: سوێند بەپەروەردگار ئەمەی ئەبوبەکر ئەنجامی دا تەنها ئەوە بوو کە خوای گەورە سنگی فراوان کرد بۆ ئەم کارە، جا ئەو کاتە زانیم لەسەرحەقەو ناهەق نیە.

ج) ﴿مادمت حياً﴾

واتە: پەروەردگارم فەرمانی پێکردووم بە نوێژوو ڕۆژوو هەتا زیندووبم.

دەتوانین لەم خاڵەدا چەند ئامۆژگاریو پەندێکی سەرەکی وەربگرین کە بریتین لە:

أ) مانای قسەکەی (عیسا) (عليه السلام) وا دەگەیەنێت کە (نوێژ کردنو زەکات دان) واجبێکی شەرعی خوای گەورەنو فەرزن لەسەر مرۆڤەکان تا ئەو کاتەی کە دەمرنو لەدنیادا نامێنن.

یان بەشێوەیەکی تر بڵێین: نوێژکردنو زەکات دان تەنها بە مردن لەسەر شانی مرۆڤەکان لادەچێت، بەتایبەتی نوێژ پەیوەستە بەهەموو کەسێکەوە جا (پیاو بێت یان ژن، فەقیر بن یان دەوڵەمەند، لەش ساغ بن یان نەخۆش، جێگیر بن یان لەسەفەردابن.. هتد).

وە زەکات دانیش بەهەمان شێوە لەسەر دەوڵەمەندا فەرزە ساڵی جارێك دەبێت ماڵو پارەی خۆیان پاك بکەنەوە لەبەشی هەژاران تا دەمرن.

بەڵام کە مردن ئەوە نە (نوێژو نە زەکات) لەسەریان نامێنێتو پاشان فەرمانیش نەکراوە بەو کەسوکاری مردووە لەپاش مردنی ئەو کەسە دەبێت بەبەردەوامی ڕۆژی (٥) جار نوێژی بۆ بکەن.

ب) ووشەی ﴿مادمت حياً﴾:

بەڵگەیەکی زۆر پتەوە لەسەر نەمانەوەی (عیسا) (عليه السلام) ئەویش بەوەی کە وەك سەرجەم بەندەکانی تر پاش بەسەربردنی ماوەیەك لە ژیاندا دەمرێتو دەچێتەوەخزمەت پەروەردگاری.

١٧- خوای گەورە لە کۆتایی باسی لەدایك بوونو بەسەرهاتی عیسادا دەفەرمێت:

﴿ ذلك عيسى ابن مريم قول الحق الذي فيه يمترون ﴾ (مريم:٣٤).

واتە: بەڕاستی ئەمە دەنگو باسی (عیسای کوڕی مەریەم) ە و پاشان قسەیەکی ڕاستە کەوا خەڵکی تێیدا دوودڵن.

باشە دەبێت خەڵکی بۆ دوودڵ بێت لەوەی کە چیرۆكوبەسەرهاتی (عیسا) بەو شێوەنەبێت کە قورئان باسی دەکات؟!

خوای گەورەو لێزان کە دروست کەری (عیسا) یەو بەتەواوی ئاگادارو شاهیدی ئەم ڕووداوەیە، خۆی شاهیدی دەدات لەڕاستێتی ئەم بەسەرهاتە بەڵام خەڵکێکی زۆر تێیدا دوودڵن؟!

بەڕاستی کارێکی سەرسوڕهێنەرو سەرنج ڕاکێشەرە کەوا خەڵکی لە کاتێکدا خۆیان ئاگاداری ئەو ڕووداوو بەسەرهاتە نینو تەنها لەدەمی خەڵکانی ترەوە دەنگو باسیان

وەرگرتووە، کەچی دوودڵن لە دەنگو باسێك کە خوای گەورە بۆیان باس بکاتو پێیان ڕابگەیەنێت؟!

سەرەکی ترین هۆکاری ئەم دوودڵیو دڵەڕاوکەیە دەگەڕێتەوە بۆ باوەڕنەهێنانو متمانە نەکردن بەو دەنگو باسەی کە خوای گەورە لە قورئاندا باسی لێوە کردووە.

قورئانیش ئەو پەرتوکە ئاسمانیەیەکە دواهەمین پەرتوکی ئاسمانیە بۆ بەندەکانو خوای گەورە لەبارەیەوە دەفەرمێت:

﴿ذلك الكتاب لاريب فيه﴾ (البقرە:٢).

واتە: ئەم کتێبە -کە قورئانە- گومانی تێدا نیە!!

کەواتە بە شێوەیکی گشتیو سەرەکی ئەو کەسانەی کە دوودڵن لە ڕووداوی عیسای کوڕی مەریەم (عليه السلام) ئەوە بەدڵنیاییەوە گومانیان هەیە لە دەربارەی قورئانو فەرموودەی خوای گەورەو سەرجەم ئەو دەنگوباسانەی کە لە قورئانو فەرموودەی پێغەمبەردا باس کراون.

١٨- دواڕوتەی (عیسا) (عليه السلام) لەبەردەم گەلەکەیدا بریتی بوو لەوەی کە پێی فەرموون:

﴿وان ربي وربكم فاعبدوه هذا صراط مستقيم﴾ (مريم:٣٦).

واتە: (عیسا) (عليه السلام) بە گەلەکەی فەرموو: ئەی خەڵکینە بەڕاستی خوای گەورە پەروەردگاری منیشو ئێوەشە بەڕاستی ئەمە ڕێگەی ڕاستە.

بەڵێ ڕێگەی ڕاست ئەوەیە کە عیسا بەبەندەی مل کەچی خوای گەورە بزانی، ڕێگەی ڕاست ئەمەیە کە چیرۆكو بەسەرهاتی عیسا (عليه السلام) وافێر ببین کە خوای گەورە بۆمان باس دەکات نەك کابرایەکی خاچ پەرست یان کەسێکی جوولەکەی دووژمن بە اسلام.

ڕێگەی ڕاست ئەوەیە کە خوای گەورە بەتەنها بناسینو عیسا (عليه السلام) بە کوڕی نەزانینو هاوەڵی بۆ پەیدا نەکەین.

ڕێگەی ڕاست ئەوەیە کە لە ڕێگەی دروست کەرو دەستەڵات دارو ڕۆزی دەروو ژێنەرو مرێنەری سەرجەم دروست کراوەکانی ئەم بوونەوەرە بزانینو باقی شتەکانی تریش بەبەندەی مل کەچو گوێڕایەڵی فەرمانی خوای گەورە بدەین لەقەڵەم.

بە پێچەوانەشەوە گەر هەرکەسو لایەنو کۆمەڵێك لەم ڕێگە ڕاستە لایان داو هەر بیروباوەڕێکی جیاواز لەم بیروباوەڕە ڕاستەیان هەبوو، ئەوە بەدڵنیاییەوە ڕێگەی ڕاستیان وون کردووەو لەناو تاریکیو گومڕاییەکی زۆر ئاشکرادا دەژینو عیسا (عليه السلام) لەوان بەریەو ئەوانیش لە (عیسا) بەرینو لە ڕۆژی قیامەتدا لە دوای شەیتانی مامۆستاو ڕێ نیشان دەریانەوە بەرەو دۆزەخ بەڕێ دەکرێنو گەورەترین سزای پەروەردگاریان بەدەست دەهێنن.

# بەندی دووەم

## بانگەوازی عیسا (عليه السلام) لەناو گەلەکەیدا

گومانی تێدا نیە کەوا (عیسا) (عليه السلام) دواهەمین پێغەمبەر بوو بۆ ناو جولەکەکان.

بەڵێ هیچ بەڵگەیەکمان نیە لە (قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کە سەرەتای بانگەوازی عیسای دیاری کردبێت، بەڵام ئەوەندە هەیە بزانین عیسا (عليه السلام) لەناو گەلی جوولەکەدا بانگەوازی خەڵکی دەکرد بۆ باوەڕهێنان و بەتاك پەرستنی خوای گەورەو وازهێنان لە دار و بەرد پەرستی و کڕنوش بردنیان بۆ غەیری پەروەردگاریان.

بەڵێ هەروەك ئاگادارین کەوا سروشتی پیسی جولەکە وەها بووە کە بەدرێژایی مێژووی پڕ تاوانیان بەردەوام لە هەوڵی بەدرۆ خستنەوەی ڕاستی بوون و هەموو کات بەرپەرچی پێغەمبەرانیان داوەتەوەو دژی بانگەواز خوازان وەستاون و سور بوون لەسەر چەوتی و بێباوەڕی خۆیان، هەروەها بەردەوام لە هەوڵی دنیاپەرستی و نوقمبووی ئارەزووەکانیاندا بوون و لەهەوڵی پارەو ماڵ پەیدا کردندا بوون جابە حەڵاڵ بێت یان بە حەرام، هەر لەبەرئەم هۆکارە بوو کەوا خوای گەورە هەندێ شتی پاك و حەلاڵی لێ حەرام کردن وەك سزادانێك، هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿فبظلم من الذين هادوا حرمنا عليهم طيبات أحلت لهم..﴾ (النساء:١٦٠).

واتە: بەهۆی ستەمی جولەکەکانەوە -کە ستەم کارا بوون- هەندێ شتی پاك کە حەڵاڵ بون لێمان حەرام کردن.

بەڵێ گەر هەر لەم ڕوانگەیەوە بڕوانینە بانگەوازی (عیسا) (عليه السلام) لەناو گەلەکەیدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە هەوڵێکی زۆری داوە لەگەڵیان و ماندوبوونێکی زۆری بەخۆیەوە دیووە.

چونکە جولەکەکان لەگەڵ سەرجەم ئەو پێغەمبەرانەی کە بۆیان ڕەوانەکرابوو ناکۆکی و دژایەتی گەورە لە نێوانیاندا هەبوو بەردەوام لە هەوڵی بەرپەرچ دانەوەی ئەو پێغەمبەرانەدا بوون هەر لەبەرئەم سروشتە پیس و دۆزەخیەیان بوو کەوا بەهەمان شێوە بەرپەرچی عیسایان دایەوەو ئازاری ماددی و مەعنەویان دەداو بەردەوام لەهەوڵ ی پیلان دانان دا بوون بۆ لەناو بردنی.

## معجزاتی عیسا (عليه السلام) بۆ گەلەکەی

پێغەمبەران کاتێ خوای گەورە ڕەوانەی کردوون بۆ ناو گەلەکانیان (معجزە) یەکیشی پێداوون کەلەگەڵ داب و نەریت و باوەڕی ئەو سەردەم و واقعەدا یەك بێت، ئەمیش بۆ ئەو مەبەستەی کە ڕاستێتی پێغەمبەرایەتی ئەو پێغەمبەرە لە بەردەم ئەو گەلەدا بسەلمێنێ و پاشان دەستەڵاتی پەروەردگاریان بۆ دەربخات.

خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرمێت:

﴿لقد أرسلنا رسلنابا لبينات وأنزلنا معهم الكتاب..﴾

واتە: ئێمە نێردراوەکانی خۆمان بەبەڵگەو معجزەی ڕوون و ئاشکراوە ڕەوانە دەکەین و پاشان پەرتوکی ئاسمانیشیان پێ دەبەخشین.

بەڵێ هەر لەم ڕوانگەیەوە (عیسا) ش (عليه السلام) هەروەك پێغەمبەرانی خاوەن (معجزەی) پێش خۆی لەلایەن خوای گەورەوە چەند معجزەو کارێکی سەرنج ڕاکێشەروو لەتوانا بەدەری پێ بەخشرا کە بریتی بوو لە:

١- دروست کردنی شتێك بەقوڕ لە وێنەی تەیرو باڵندەداو پاشان فوی پێدا دەکردوو دەبووە باڵندەیەکی زیندوو دەفڕی بەفەرمانی خوای گەورە قورئان لەم بارەوە دەفەرمێت:

﴿أني أخلق لكم من الطين كهيئة الطير فأنفخ فيه فيكون طيراً بإذن الله﴾ (ال عمران:٤٩).

واتە: (عیسا) (عليه السلام) بەگەلەکەی فەرموو:

((من بۆتان دروست دەکەم لە قوڕ (شتێك) لە وێنەی باڵندە، وەفووی پێدا دەکەم و پاشان دەبێت بە باڵندە بەفەرمانی خوای گەورە)).

٢- چاککردنەوەی ئەوکەسانەی کە شەوکوێر یان ڕۆژکوێرن و چاویان نابینێت هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿وأبرئ الأكمه﴾ (ال عمران:٤٩).

(ابن کثیر) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمێت:

(انه الذي يبصر نهارا ولا يبصر ليلاً، وقيل بالعكس..)[١]

---

(١) تفسير ابن كثير/ج(١)- (ص: ٣٧٣).

واتە: (الأکمە) بریتی‌یە لەو کەسەی کە بەڕۆژ دەبینێ‌و بەشەو نابینێت، وە یان بە پێچەوانەوە.

هەروەها یەکێکی تر لە زانایان دەفەرمێت:

((الأکمه هو الذي يولد أعمى..)) .

واتە: (الأکمە) بریتی‌یە لەو کەسەی کەبە کوێری لەدایك دەبێت.

٣- چاککردنەوەی کەسانێك کە توشی نەخۆشی پیسێ‌و (بەڵەك) ی بوبون بە فەرمانی خوای گەورە هەروەك دەفەرمێت:

﴿وأبرئ الأكمه والأبرص﴾ (ال عمران:٤٩).

٤- زیندوکردنەوەی مردوو بەیارمەتی‌و فەرمانی خوای گەورە هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿وأحيي الموتى باذن الله﴾ (ال عمران:٤٩).

٥- هەواڵ دان بە خەڵکی بەوەی کەدەی خۆن‌و ئەوەی کە لە ماڵیشەوە هەڵیان گرتووە، ئەویش بەوەی کە کاتێك خەڵکی دەهاتنە لای پێ‌ی دەفەرموون فلانە خواردنتان خواردووەو پاشان فلانە خواردنی تریشتان لەماڵەوە داناوە وەك زەخیرە لە ماڵدا هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿وأنبئكم بما تأكلون وما تدخرون في بيوتكم﴾ (ال عمران:٤٩).

پاش ئەم (معجزانە) (عیسا) (عليه السلام) بۆ مەبەستی زیاتر ئاسان کردنی دینی خوای گەورە لەسەرشانی گەلەکەی بەفەرمانی پەروەردگاری هەندێ لەو شتە حەرام کراوانەی کە لە شەریعەتی پێش خۆیدا هەبوو حەڵاڵی کردوو ڕای‌گەیاند کەوا خواردنی ئەم شتانە دروستەو حەڵاڵە.

قورئان لەم بارەوە دەفەرمێت:

﴿ ولأحل لكم بعض الذي حرم عليكم.. ﴾ (ال عمران:٥٠).

واتە: هاتووم بۆ ئەوەی هەندێ لەو شتە حەرامانەتان بۆ حەڵاڵ بکەم!!

(ابن کثیر) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمێت:

((فيه دلالة على ان عيسى (عليه السلام) نسخ بعض شريعة التوراة وهو الصحيح..))(٢).

---

(٢) تفسير ابن كثير / ج١ (ص: ٣٧٢) طبعة دار المعرفة / ١٩٩٦.

واتە: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی (عیسا) (عليه السلام) هەندێك لەشەریعەتی (تەورات) ی سڕیوەتەوە، کە ئەمە ڕاستە.

بەڵێ ئەم ئایەتە دەدوێ دەربارەی ئەوەی کە جولەکەکان لەسەردەمی موسادا (عليه السلام) هەندێ خواردنی حەڵاڵیان لە خۆیان حەرام کردبوو، پاشان لەگەڵ ئەوەشدا ستەم کار بوون خەڵکیان دەچەوساندەوەو ماڵی میللەتیان بەبەتاڵ دەخوارد، خوای گەورە وەك سزادانێکیان هەندێ شتی حەڵاڵی لێ حەرام کردن، بەڵام وەك باسمان کرد کاتێ عیسا هات (عليه السلام) هەندێ یاسای لەشەریعەتی پێش خۆی -کە تەورات- بوو سڕیەوەو ئەو شتە حەرامانەی کە لە دینی موسادا حەرام بوون بۆ جولەکە، بۆی حەڵاڵ کردنەوە بەفەرمانی پەروەردگاری.

## مژدەو ئامۆژگاری (عیسا) (عليه السلام) بۆ گەلەکەی

گومانی تێدا نیە کە ڕەوشتی پێغەمبەران بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی لەسەرەتای بانگ کردنی خەڵکیدا بۆناو دینی خوای گەورە وەها بووە کە ئامۆژگاری گەلەکەیان کردووەو پاشان مژدەدەر بوون بەو کەسانەی کە شوێنیان کەوتوون و گوێڕایەڵی فەرمانەکانیان بوون.

بەڵێ (عیسا) ش (عليه السلام) هەروەك زنجیرە برای ئەو پێغەمبەرانە سەرەتای بانگەوازی لەناو گەلەکەیدا بە ئامۆژگاری خێرو مژدەدانی دنیاو قیامەتی بۆ گەلەکەی باس کرد.

ئەم مژدەو ئامۆژگاریانەش لە دوای ئەوەی کە چەندین (معجزە) و کاری سەرسوڕهێنەرو بەدەر لە ووزەی مرۆڤەکان ی لێبینرا، هەروەك پێی فەرموون:

((ئەی گەلەکەم من هاتووم بۆلای ئێوەو حکمەتو بەڵگەی ئاشکرام بۆ هێناوون لەسەر ڕاستێتی پێغەمبەرایەتی خۆم، پاشان من دەبمە دادوەر لە نێوانتاندا لەسەر ئەو شتانەی کە ئێوە جیاوازی ڕاو بۆچوون تان هەیە لە دەربارەیەوە، تا بۆتان ڕوون بکەمەوەو گومان لە دڵتانادا نەهێڵم))!!

ئەی گەلەکەم ئاگاداری پاشەڕۆژی خۆتان بن و خۆتان لەبێ فەرمانی خوای گەورە بپارێزن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بکەن، چونکە (الله) پەروەردگاری من و ئێوەشە، کەواتە بی پەرستن و کڕنوشی بۆ بەرن، بەڕاستی ئەمە ڕێگای ڕاستەو ڕزگارتان دەکات لە سزای سەخت ی خوایی، قورئان لەم بارەوە دەفەرمێت:

﴿ولما جاء عيسا بالبينات قال قد جئتكم بالحكمة ولأبين لكم بعض الذي تختلفون فيه فاتقوا الله وأطيعون * ان الله هو ربي وربكم فاعبدوه هـــذا صـــراط مســـتقيم﴾ (الزخرف:٦٣-٦٤).

لەپاش ئەم ئامۆژگاریانە (عیسا) (عليه السلام) مژدەیەکی زۆر گەورەیدا بە گەلەکەی کە ئەویش بریتی بوو لەوەی کە پێی فەرموون:

﴿وإذ قال عيسىٰ ابن مريم: يا بني اسرائيل اني رسول الله اليكم ومصدقاً لما بـــين يدي من التوراة ومبشراً برسول يأتي من بعدي اسمه أحمد﴾ (الصف:٦).

واتە: (عیسا) ی کوڕی (مەریەم) فەرمووی: ئەی گەلی بەنی اسرائیل بەڕاستی من وەك پێغەمبەرێك لەلایەن خوای گەورەوە ڕەوانە کراوم بۆلای ئێوە، پاشان من تەورات کەلەپێش منـدا هـەبووە بەڕاسـتی دەزانمو (تـەصدیق) ی دەکـەمو لەگـەڵ ئەوەشـدا مژدەتان پێ دەدەم بە پێغەمبەرێ کەلەپاش من دێتو ناوی (احمد) ە.

## عیسا (عليه السلام) هەست بەبێباوەڕی گەلەکەی دەکات

(عیسا) (عليه السلام) پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر لـەناو گەلەکـەیدا بانگـەوازی کـردوو ئامۆژگـاری کـردن، دەبینێـت کـەوا ڕۆژ بـەڕۆژ بێبـاوەڕی زیـاتر لـە گەلەکـەیدا دەردەکەوێتو زیاتر ڕەوشتە نەفامیو دۆزەخیەکان تیایاندا ڕەنگ دەداتەوە.

هەر لەبەر ئەم هۆکارەبوو کەوا (عیسا) (عليه السلام) ڕووی کردە گەلەکەیو فەرمووی:

ئەی گەلەکەم کێ لە ئێوە یارمـەتی دەروو سـەرخەرم دەبێـت لـەکاتێکدا خـەڵکی بانگ دەکەم بۆلای خوای گەورەو بانگەوازی ئەو کەسانە دەکەم کـە دوورن لـە دینـی خوای گەورە؟!

لەم کاتەدا هەندێ کەس لەو گەلەدا کەبە (الحواريون) ناو دەبرێن ئیمانو باوەڕی پتەویان وەك بورکـانێك لـەناخیاندا دەنگـی لێ بـەرز بوویـەوەو دەسـت بـەجێو زۆر بە ئاشکرا فەرموویان:

((ئەی عیسا!! ئـەی بـەندەی خـوا !! ئێمـە پـەیمانت پـێ دەدەیـن کـە یارمـەتیت بدەینو ببینە هۆکاری سەرخستنی دینی خوای گەورە، قورئان لەم بارەوە دەفەرمێت:

﴿ فلما أحس عيسى منهم الكفر قال من أنصاري الى الله؟! قال الحواريون نحـــن أنصار الله..﴾ (آل عمران:٥٢).

واتە: کاتێ (عیسا) (عليه السلام) هەستی بەبێباوەڕی گەلەکەی کرد فەرمووی:

ئایا کێن ئەو کەسانەی کە یارمەتیم ئەدەن لەسەر ڕێگەی دین داری و بانگ کردنی خەڵکی بۆلای خوای گەورە؟! پاشان هاوڕێکانی (الحواریون) فەرموویان ئێمە یارمەتیدەرانی دینی خواین.

(سید قطب) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدات دەفەرمێت:

((ولابد لكل صاحب عقيدة ودعوة من انصار ينهضون معه، ويحملون دعوته ، ويحامون دونها، ويبلغونها الى من يليهم ويقومون بعدة عليها))[٣].

(ابن كثير) لە تەفسیری (من انصاري الى الله) دا دەفەرمێت:

((والظاهر انه اراد من انصاري في الدعوة الى الله))[٤].

واتە: ئەوەی دیار بێت و ئاشکرابێت لە ئایەتی ﴿من أنصـاري .. ﴾ دا ئەوەیە کە مەبەست پێی یارمەتی دانی (عیسا) بووە لە بانگەوازکردن بۆلای خوای گەورەدا.

## ووتەی ( حەواریەکان ) لەبەردەم عیسادا

هەروەك باسمان کرد حەواریەکان بریتیبوون لەو کەسانەی کە هاوڕێی (اصحاب) عیسا بوون (عليه السلام) و لەناو گەلەکەیانداو بەتەنها پشت گیری خۆیان بۆ (عیسا) (عليه السلام) ڕاگەیاندو چەند ووتەیەکی بەنرخیان فەرموو کە بریتی بوون لەمانە.

ا) ﴿نحن أنصار الله﴾

واتە ئێمە سەرخەری خواین: ئەمیش بەو مانایەی کە سەر خەرو خەم خۆری دینی خوای گەورەین و ئامادەین خۆمان و ماڵ و گیانمان لەم پێناوەدا بەخت بکەین و کۆڵ نەدەین.

ب) ﴿آمنا با لله﴾

واتە: باوەڕی بتەوو بەهێزمان بەپەروەردگارمان هەیەو ئامادەین لەپێناوی ئەو باوەڕەماندا هەموو ناڕەحەتیەك ببینین.

ج) ﴿واشهد بأنا مسلمون﴾

واتە: ئەی (عیسا) تۆش شاهیدی ئەوەمان بۆ بدە کە ئێمە موسڵمانین و بەتەواوی خۆمان تەسلیمی پەروەردگارمان کردووە.

پاشان هاوڕێکانی عیسا (عليه السلام) ڕوو دەکەنە پەروەردگاریان و دەڵێن:

---

(٣) في ظلال القران / ج١ (ص: ٥٩٣).

(٤) تفسير ابن كثير /ج١ (ص: ٣٧٣).

أ) ﴿ربنا امنا بما أنزلت﴾

واتە: ئەی پەروەردگارمان باوەڕمان بەوە هەیە کە ناردووتەتە خوارەوە -کە ئینجیلە-.

ب) ﴿واتبعنا الرسول﴾

واتە: پاشان شوێن پێغەمبەرەکەت دەکەوین و گوێڕایەڵی تەواوی دەکەین لەسەرجەم فەرمانەکانیدا.

ج) ﴿فاكتبنا مع الشاهدين﴾

واتە: پەروەردگارمان لەپاش ئەوەی کە باوەڕمان هێنا بە (ئینجیل و عیسا) وەك پێغەمبەرێکی خاوەن پەرتوکی ئاسمانی کەواتە بمان نوسە لەگەڵ شاهیدەکان و لە کۆمەڵ و گروپ و لایەنی ئەوانە حسابمان بکە کە شاهیدی ایمانیان لێ وەرگیراوەو پێی بوونەتە ایمان داری ڕاستەقینە.

(ابن عباس) لە تەفسیری (فاكتبنا مع الشاهدين) دا دەفەرمێت:

(مع امة محمد (ﷺ) وهذا اسناد جيد).[٥]

واتە: لەگەڵ ئومەتی (محمد) بە شاهیدیمان بنوسەو ئەو شەهادەتەی کەدەی دەین لەسەر یەکتایی تۆ -واتە خوای گەورە- لێمان قبوڵ بکەو بە شاهید حسابمان بۆ بکە.

پاشان (سيد قطب) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمێت:

(ان المؤمن بدين الله مطلوب منه ان يؤدي شهادة لهذا الدين شهادة تؤيد حق هذا الدين في البقاء، وتؤيد الخير الذي يحمله هذا الدين للبشر.. وهو لايؤدي هذه الشهادة حتى يجعل من نفسه ومن خلقه ومن سلوكه ومن حياته صورة حيه لهذا الدين، صورة يراها الناس فيرون فيها مثلاً رفيعاً.. ).[٦]

واتە: داواکراوە لە مرۆڤی موسڵمانی باوەڕدار کە شاهیدی بدات لەسەر ڕاستێتی ئەم دینە، شاهیدی دانێك دەری ببڕێ کە هەر ئاینی خوای گەورە مافی مانەوەو پەیڕەوی کردنی هەیە وە شاهیدی بدات لەسەر ئەوخێرەی کە خۆی وەك دین هەڵیگرتووە بۆ مرۆڤایەتی بەگشتی، بێگومان ئەم شاهیدیەش تەواو نابێت و جێی خۆی ناگرێت تا لە ناخەوە بەڕاستی دەری دەبڕێت و پاشان لە سلوك و خو ڕەوشت و

---

(٥) تفسير ابن كثير / ج١ (ص: ٣٧٤).

(٦) في ظلال القران (الشهيد سيد قطب) ج١/ (ص: ٥٩٤).

ژیانیدا بەشێوەیەکی زیندو ڕەنگ دەداتەوەو لەسەر زیندوویێتی ئەم دینە، وێنەو ڕەنگ دانەوەیەك کەخەڵکی دەیبینن و لەکاتی ئەو بینینەدا نمونەیەکی بەرزیان بۆ دەردەکەوێ.

## داواکاری (حەواریەکان) لە عیسا بە دابەزینی سفرەیەك خواردن لە ئاسمانەوە:

هاوەڵە بەڕێزەکانی (عیسا) (عليه السلام) داوایان کرد لە (عیسا) کە داوابکات لە پەروەردگاری بە دابەزینی (خوانێك) (سفرە) یەك لە ئاسمانەوە کە پڕی بێت لە نان و خواردن بۆیان، ئەمیش بۆ مەبەستی ئەوەی کەلێی بخۆن و برسێتییانی پێلابەرن و پاشان زیاتر دڵ و دەروونیان پتەوتربێت و باوەڕیان زیاتر بۆ درووست ببێت بەپەروەردگاریان، هەر لەبەر ئەمە بوو کەوا سەرجەم بەکۆ ڕوویان کردە (عیسا)و پێیان ووت:

ئەی پێغەمبەری خوا ئایا پەروەردگارت دەتوانێت کەوا لەئاسمانەوە خواردنمان لەسەر سفرەیەك بۆ دابەزێنێ؟!

عیسا (عليه السلام) داواکاریەکەیانی زۆر بەلاوە گەورە بوو کەم ڕێزی و تاوانی لەناوەرۆکی ئەم داواکاریەدا بەدی دەکرد، هەر بۆیە لەم کاتەدا وەڵامی دانەوەو پێی فەرموون:

ئەی هاوەڵە بەڕێزەکانم ئاگاداری زمان و دڵی خۆتان بن و لەپەروەردگارتان بترسن گەر خۆتان بەباوەڕدار دادەنێن!!

هاوەڵە بەڕێزەکانیشی لەوەڵامی (عیسا) دا فەرموویان:

ئەی نێردراوی خوا ئێمە لە داواکردنی ئەو خواردنەدا مەبەستمان ئەوەنیە کە بەهێزی و بێهێزی خوای گەورە تاقی بکەینەوە!! بەڵکو مەبەستی سەرەکیمان لەم داواکاریەمان چەند خاڵێکی گرنگە کە بریتین لە:

ا) ﴿نأكل منها﴾

واتە: لێی بخۆین و برسێتیمانی پێ بڕەوێنینەوە.

ب) ﴿وتطمئن قلوبنا﴾

واتە: دڵنیا بین و بەتەواوی و زیاتر متمانەمان بە هێزو دەسەڵاتی پەروەردگارمان هەبێت و پاشان زیاتر لەجاران بڕوامان بە پێغەمبەرایەتی تۆو ڕاستێتی ئەو پەرتوکە ئاسمانیە هەبێت کەلەلایەن خوای گەورەوە بەناوی (ئینجیل) هوە پێت بە خشراوە.

ج) ﴿ونعلم أن قد صدقتنا﴾

واتە: پاشان بۆ ئەوە بزانین و دڵنیا بین لەوەی کە وەك دین، وەك فەرمانی خوایی، وەك مژدەدان بە بردنەوەمان لە دنیا و دواڕۆژدا.. هتد، پێت ڕاگەیاندوین.

د) ﴿ونكون عليها من الشاهدين﴾

واتە: بۆ ئەوەی کە شاهیدی بدەین لەسەر ئەمەی کە ئەم ڕوداوە -واتە هاتنە خوارەوەی سفرەیەك خواردن لە ئاسمانەوە- معجزەیەکە لەلایەن خوای گەورەوەیەو بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتی‌و ڕاست گۆیی تۆ.

قورئان لەم بارەوە دەفەرمێت:

﴿ اذ قال الحواريون يا عيسى ابن مريم هل يستطيع ربك أن ينزل علينا مائدة من السماء قال اتقوا الله ان كنتم مؤمنين * قالوا نريد أن نأكل منها وتطمئن قلوبنا ونعلم أن قد صدقتنا ونكون عليها من الشاهدين ﴾ (المائدة:١١٢-١١٣).

واتە: هاوەڵەکانی (عیسا) ووتیان:

ئەی عیسای کوڕی مەریەم ئایا پەروەردگارت دەتوانێت کەوا لە ئاسمانەوە سفرەیەك ی پڕ لە خواردنمان بۆ دابەزێنێت؟!

عیسایش (عليه السلام) فەرمووی:

لە خوابترسن‌و ئاگاداری خۆتان بن گەر ئێوە باوەڕدارن.

هاوەڵەکان لەوەڵامدا ووتیان:

دەمانەوێ لەو خواردنە بخۆین‌و دڵەکانمان ئارام بگرن‌و پاشان بزانین لەوەی کە تۆ ڕاستت لەگەڵ کردووین‌و لە کۆتایشدا شاهیدی بدەین لەسەر ئەم ڕووداوە.

بەڵێ لەپاشاندا عیسا (عليه السلام) ڕووی دڵ‌و دەمی بەندایەتی خۆی کردە پەروەردگاری‌و فەرمووی:

ئەی پەروەردگارم داوات لێ دەکەین‌و لێت دەپاڕێینەوە کە لە ئاسمانەوە (سفرەیەك ی پڕ لەخواردن) مان بۆ بنێرە خوارەوە بۆ سەر زەوی بۆ ئەوەی کە ببێتە هۆی جەژن‌و شادی بۆ ئێمەو ئەوانەی دوای ئێمەش‌و لەگەڵ ئەوەشدا ببێتە بەڵگەیەکی پتەو لەسەر دەستەڵات‌و گەورەیی تۆ.

کەواتە ئەی پەروەردگار ڕزقمان بدە چونکە تۆ باشترینی ڕۆزی دەرانی.

خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرمێت:

﴿ قال عيسى ابن مريم اللهم ربنا أنزل علينا مائدة من السماء تكون لنا عيداً لأولنا وءاخرنا وءاية منك وارزقنا وأنت خير الرازقين﴾ (المائدة:١١٤).

## وەڵامی خوای گەورە لەبەرامبەر ئەم داواکاریە

خوای گەورە زۆر باش ئاگاداری ئەم گفت و گۆو داواکاریەیەو ئەزانێو زانستی بێسنوری هەیە لە ناوەڕۆکی ئەم کارەو گوێ بیستی سەرجەم قسەکانیانە.

بەڵێ خوای گەورە لەوەڵامی داواکاریەکەی (عیسا) (عليه السلام) دا فەرمووی:

﴿اني منزلها عليكم فمن يكفر بعد منكم فاني أعذبه عذاباً لا أعذبه أحداً من العالمين﴾ (المائدة:١١٥).

واتە: ((خوا فەرمووی: من ئەو سفرە پڕ لە خواردنە دادەبەزێنم بەڵام هەرکەس لەدوای ئەم ڕوداوە بێبڕواو ناسوپاس بێت ئەوە سزادانێك سزای دەدەم کە هیچ کەس بەو شێوە لە جیهاندا ئازار نەدرێت، یان ئازار نەدرابێت)).

## چەند ڕوون کردنەوەو پرسیارو سەرنجێك لەدەربارەی ئەوسفرە پڕ لە خواردنەی کە داواکرا لەخوای گەورە بە دابەزینی لە ئاسمانەوە؟!!

بێگومان مەسەلەی ئەم سفرە پڕ لە خواردنەی کە هاوەڵەکانی (عیسا) (عليه السلام) داوایان کرد هەر بەوەندە تەواو نابێتو بەسەرهاتەکەی کۆتایی پێنایەت، چونکە هەندێ ووشە لە ئایەتەکاندا هاتونو باس کراون کە پێویستی زیارتیان بە ڕاڤە (تفسیر) هەیەو پاشان ئەیان پرسیاری تر لە دڵەکاندا دروست دەبن کە (انشاء الله) بە کۆمەکی پەروەردگارو بەپێی توانا وەڵامیان دەدەینەوە.

گومانیشی تێدا نیە کە وەڵام دانەوی پرسیارەکانو زیاتر ڕاڤە کردنی (تفسیر) ی ئەو ئایەتانەی کە باسی ئەم ڕوداوە دەکەن هەروا کارێکی ئاسان نیە کە نوسەر بەتێگەیشتنو فکری خۆی بنوسێت لەبارەیەوە ڕوون کردنەوەی لاولوو بێ بەڵگە بخزێنێتە ناو باسەکەوە.

بەڵکو لەم باسەدا -بەتایبەتی- پێویستی زۆرمان بەوە هەیە کە فکرو بۆچوونو (اجتهادات) ی خۆمان بەجێ بهێڵینو بچینە خزمەت زانایانی (تفسیر) کە لەم بارەیەوە قسەیان کردووە.

*هەر بۆ ئەم مەبستە پشتمان بەم تەفسیرانە بەستوە کە لە پەراوێزەکاندا ئاماژەی بۆ ئەکەین، ئەوانیش بریتین لە:*

١- تفسیر الكبير (فخرالدين الرازي).

ب- الجامع الأحكام القران (للقرطبي).

ج- تفسير القران العظيم (ابن كثير).

د- تفسير المراغي (احمد مصطفى مراغي).

گەر زیاتر سەرنج بدەینە سەرەتای ئەم ڕوداوە ئەوە بەشێوەیەکی تەروو شارەزاییەکی زیاترەوە لێی حاڵی دەبین کە ئەویش بریتی‌یە لەوەی کە لەسەرەتادا خوای گەورە دەفەرمێت:

أ) ﴿اذ قال الحواريون﴾

واتە: (حەوارییەکان ووتیان)

ئا لێرەدا زۆر پێویستە کە بزانین (الحواريون) کێن‌و بە کێ دەڵێن:

(ابن كثير) لە پێناسەی ووشەی (الحواريون) دا دەفەرمێت:

(وهم إتباع عيسى (عليه السلام).[7]

واتە: الحواريون بريتى بوون لە شوێن کەوتەی (عیسا) (عليه السلام).

هەروەها (عفيف عبد الفتاح طبارة) ش دەفەرمێت:

(الحواريون هم اصحاب عيسى وتلاميذه المقربون وكانوا اثنى عشرة رجلاً- وهم المبشرون بلغة هذا العصر- الذين ارسلهم المسيح في حياته للتبشير بديانته).[8]

واتە: (الحواريون) بريتى بون لە هاوەڵەکانی (عیسی) وەهەروەها بریتی‌بوون لە قوتابیە نزیکەکانی کە ژمارەیان (١٢) پیاو بوو - پاشان لە سەردەمی خۆیاندا پێیان دەوترا مژدەدەرەکان بە زمانی ئەوسەردەمە -ئەمانەش بریتی بوون لەو کەسانەی کە (عیسی) (عليه السلام) لە ژیانی خۆیدا دەی ناردن‌و بڵاوی دەرکردنەوە بۆ مەبەستی مژدەدان بە خەڵکی بە هاتن ی ئەو دینە.

٢-گەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین، بەرۆکەش دەبینین کە دەفەرمێت:

﴿هل يستطيع ربك أن ينزل علينا مائدةً من السماء﴾ (المائده:١١).

واتە: ئایا پەروەردگارت دەتوانێت!!؟ کە لە ئاسمانەوە سفرەیەك ی پڕ لە خواردن مان بۆ دابەزێنیتە خوارەوە؟!

زانایان لە (تەفسیر) ی ووشەی (يستطيع) دا دەفەرموون:

---

(٧) تفسير القران العظيم (ابن كثر ، ج١ ، ص١٢٠)

(٨) مع الأنبياء في القران الكريم / ص٣٢٤ (عفيف طبارة).

(ان استطاعة بمعنى أطاع والسين زائدة).[9]

واتە: ووشەی (استطاعة) بە واتای بە قسەکردن و بەگوێکردن دێت و پیتی (س) ی (استطاعة) کەش زیادەیە.

کەواتە گەر وابێت ئەوە ئایەتەکە بەم جۆرەی لێدێت:

(ئەی عیسا ئایا پەروەردگارت وەڵامت دەداتەوەو بەقسەت دەکات ئەگەر داوای ئەوەی لێ بکەیت لە ئاسمانەوە سفرەیەکی پڕ لە خواردنت بۆ دابەزێنێ؟!)

بێگومان ئەم بۆچوونە زیاتر مانای ئایەتەکە دەدات بەدەستەوەو مەبەستی سەرەکی داواکاریەکەیە، چونکە هاوەڵەکانی (عیسا) (عليه السلام) گومانیان لەگەورەیی و دەستەڵاتی بێسنوری پەروەردگاریان دا نەبوو، بەڵکو پرسیاریان لەجێبەجێکردن و وەڵام دانەوەی داواکاریەکەی خۆیان بوو کە گوایا گەر ئێمە –واتە هاوەڵەکانی عیسا– (عليه السلام) داواکاریەکی وەهامان هەبێت پەروەردگارمان وەڵاممان دەداتەوە؟!

٣- گەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین کەوا ووشەی (رب) هاتووە هەروەك دەفەرمێت:

﴿هل يستطيع ربك..﴾ فخر الدين ی ڕازی لە تەفسیری ووشەی (رب) دا کە لە ئایەتەکەدا هاتووە دەفەرمێت:

((المراد با لرب هو جبريل (عليه السلام) لانه كان يربيه ويخصه بأنواع الأعانة))

واتە : مەبەست لەووشەی ( رب) بریتی‌یە لە (جبرەئیل) چونکە جوبرەئیل پەروەردەی کردووە

٤- مەبەستی هاوەڵەکانی (عیسا) لە دابەزینی ئەو سفرە پڕ لە خواردنە چەند شتێك بوو کە یەکێکیان بریتی‌بوو لە دڵنیا بوون و ئارام بوونیان هەروەك دەفەرمێت:

﴿وتطمئن قلوبنا﴾.

ئیمامی (قرطبی)[10] لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمێت:

ئەم قسەیەی کە هاوەڵەکانی عیسا کردیان سێ مانا دەگەیەنێت کە بریتین لە.

أ) ﴿تطمئن الى أن الله تعالى بعثك الينا نبيا﴾:

واتە: دڵ ئارام و دڵنیا بین لەوەی کەخوای گەورە تۆی بە پێغەمبەر ناردووەتە لای ئێمە ئەمەیش بۆ ئەوەی بە هیچ جۆرێك گومانمان لە پێغەمبەرایەتی تۆدا نەبێت.

ب) ﴿تطمئن على أن الله تعالى قد أختارنا لدعوتنا﴾:

---

(٩) تفسير الكبير / فخرالدين الرازي ج١٢ / (ص: ١٢٩).

(١٠) الجامع لأحكام القران (للأيمام القرطبي) ج٦ / (ص: ٣٦٦).

واتە: دڵنیا بین لەوەی کە خوای گەورە هەڵی بژاردووین بۆ ئەم بانگ کردنە.

ج) ﴿تطمئن على أن الله تعالى قد أجابنا الى ماسألنا﴾:

واتە: دڵنیا بین لەوەی کە خوای گەورە وەڵامی دواکاریەکەمان دەداتەوە.

هەروەها مهدوی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمێت:

(تطمئن الى ان الله قد قبل صومنا وعملنا)[11].

واتە: دڵنیا بین لەوەی کە خوای گەورە ڕۆژوو کردەوەکانی قبوڵ کردووین.

بەهەمان شێوە (فخر الدين ی رازی) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمێت:

(کاتێ هاوەڵەکانی عیسا (عليه السلام) ئەم داواکاریەیان هەبوو (عیسا) (عليه السلام) پێی دەرمووون):

(ئێوە لە پێش ئەم داواکاریەدا زۆرتان کاری سەرسوڕهێنەرو(معجزات) تان لە منەوە بینی کەواتە داوای کاری وا مەکەن‌و لە پەروەردگارتان بترسن، هاوەڵەکانیشی لەوەڵامدا ووتیان بە (عیسا)):

ئەی پێغەمبەری نێردراوی خوایی ئێمە لە داواکردنی ئەم سفرە پڕ لە نعمەت‌و خواردنەدا تەنها مەبەستمان پێی بینینی (معجزە) یەك نیە بەڵکو چەندین مەبەستمان هەیە کە بریتین لە:

*أ) انا نريد ان ناكل منها فاءن الجوع قد بلغنا ولا نجد طعاماً اخر:*

واتە: ئێمە دەمانەوێت لەو خواردنە بخۆین چونکە بەڕاستی برسێتی زاڵ بووە بەسەرمانداو خواردنیشمان دەست ناکەوێت.

*ب) انا وان علمنا قدرة الله تعالى بالدليل، وكذلك اذا شاهدنا نزل هذه المائدة لزداد اليقين وقويت الطمانينة:*

واتە: ئێمە دەزانین‌وزانیاریمان بە دەستەڵاتی پەروەردگار هەیە بە بەڵگەوە بەڵام ئەگەر بینیمان کەوا سفرەیەکی پڕ لە خواردن لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە ئەوە بەتەواوی باوەڕمان بتەو تر دەبێت‌و دڵ ئارام دەبین.

*ج) انا وان علمنا بسائر المعجزات صدقك ولكن اذا شاهدنا هذه المعجزات لزداد اليقين والعرفان وتاكدت الطمانينة.*

---

(١١) الجامع لأحكام القران (للأمام القرطبي) ج٦ / (ص: ٣٦٦).

واتە: ئێمە دەزانین و زانستمان بەسەرجەم (معجزات) ەکان هەیەو بەڕاستی دەزانین و گومانمان تێدا نیە، بەڵام ئەگەر ئەم معجزیەشمان بینی ئەوە بە تەواوی دڵ ئارام دەبین و یەقینمان زیاتر بۆ دروست دەبێت.

د) *(ان جميع تلك المعجزات التي اوردتها كانت معجزات ارضية، وهذه معجزة سماوية وهي اعجب واعظم فاءذا شاهدنا كنا عليها من الشاهدين نشهد عليها عند الذين لم يحضروها من بني اسرائيل، ونكون عليها من الشاهدين لله بكمال القدرة ولك بالنبوة).*[12]

واتە: سەرجەم معجزاتەکانی تر کە هاتووەو ڕوی داوە معجزیەك بوون لەسەر زەوی، بەڵام ئەمەی ئێمە داوای دەکەین (معجزە) یەك ی ئاسمانیەو سەرسوڕهێنەر ترو گەورەترە لە معجزەکانی سەر زەوی، ئەگەر ئەم کارەمان بینی ئەوە ئێمە دەبینە شاهید ی ئەم مەسەلەیە لەلای ئەو کەسانە لەگەڵ بەنی ئیسرائیل کە ئامادەی ئەم ڕووداوە نەبوون و نەیان بینیوە، پاشان دەبینە شاهید لەسەر دەسەڵاتی بێ سنوری خوای گەورەو پێغەمبەرایەتی تۆ!!!

٥ - داواکاری هاوەڵەکانی (عیسا) (عليه السلام) هەروەك باسمان کرد بۆ ئەوە نەبوو کە هێزو دەسەڵاتی خوای گەورە تاقی بکەنەوە یان هەر لە بنەڕەتدا باوەڕیان بە هێزو دەسەڵاتی پەروەدگاریان نەبێت بەڵکو بۆ زیاتر دڵ دامەزراندن و دڵ نەوایی یان بوو هەروەك (ابراهیم) (عليه السلام) داوای کرد لە پەروەگاری کە چۆنیەتی زیندوکردنەوەی نیشان بدات وەك قورئان دەفەرمێت:

﴿واذ قال ابراهيم رب أرني كيف تحي الموتىٰ﴾ (البقره:٢٦٠).

واتە: (ئیبراهیم) فەرمووی:

((ئەی پەروەردگارم نیشانم بدە کە چۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە؟!)). خوای گەورە لەوەڵامدا پێی فەرموو: ﴿أولم تؤمن؟!﴾ (البقرة: ٢٦٠).

واتە: ئەی ئیبراهیم بڕوات نیە بەوەی پەروەردگارت مردوو زیندو دەکاتەوە؟! ابراهیم لەوەڵامدا فەرمووی:

((بلىٰ ولكن ليطمئن قلبي)) (البقرة: ٢٦٠)

---

(١٢) التفسير الكبير (فخر الدين الرازي) ج١٢ / ص١٣١.

واتە:بەڵێ ئەی پەروەردگارم من باوەڕم هەیە بەڵام حەز دەکەم زیاتر دڵم دابمەزرێ لەسەر ئەو مەسەلەیە.

کە گومانی تێدا نیە داواکاری هاوەڵەکانی (عیسا) ش (عليه السلام) بۆ هەمان مەبەست بوو.

٦ - کاتێ (عیسا) (عليه السلام) داوای کرد لە پەروەردگاری بەدابەزینی ئەو سفرە پڕ لە خواردنە پاشان فەرمووی:

﴿تكون لنا عيداً لأولنا واخرنا﴾ (المائده:١١٤).

واتە: بۆ ئەوەی ببێت بە جەژن بۆ ئەمانەی ئێستاو ئەوانەی پاش ئێمەش.

ئا لێرەدا زانایان چەند بۆچوون و تەفسیرێکی جیاوازیان بۆ ئەم ئایەتە هەیە کە ئەمانەن:

أ) قال السدي:

((اي نتخذ ذلك اليوم الذي نزلت فيه عيداًنعظمه نحن ومن بعدنا)).(١٣)

واتە: (سەدی) دەفەرمێت: بۆئەو مەبەستەی ئەم ڕۆژەی کە ئەم سفرەو خوانە دادەبەزێ بیکەینە ڕۆژێکی گەورەو جەژن چ بۆ خۆمان و چ بۆ ئەوانەی دوای ئێمەش.

ب) قال سفيان الثوري:

(يعني يوماً نصلي فيه).(١٤)

واتە: سفیان ی سەوری دەفەرمێت:

بەواتای ئەوەی کە لەو ڕۆژەدا نوێژی تێدا بکەین.

ج) قال سلمان الفارسي:

(عظة لنا ولمن بعدنا).(١٥)

واتە: سەلمانی فارسی دەفەرمێت:

ببێت بە پەندو ئامۆژگاریەك بۆ خۆمان -هاوەڵەکانی عیسا لەو کات و سەردەمەدا- و پاشان ئەوانەی دوای خۆشمان.

پرسیار/ ئایا خوای گەورە ئەو سفرە پڕ لە خواردنەی کە لەلایەن (عیسا) و (هاوەڵەکانی)یەوە داوای لێ کرا دای بەزاندە سەر زەوی؟!

---

(١٣) تفسير ابن كثير ج/٢ (ص: ١٢٠).

(١٤) هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

(١٥) تفسير ابن كثير ج/٢ (ص: ١٢٠).

وەلام/ بێگومان زانایان ڕاو بۆچونی جیاواز هەیە لەنێوانیاندا دەربارەی ئەم مەسەلەیە کە هەریەکەیان بەڵگە لەسەر ڕاو بۆچونەکەی خۆی دەهێنێتەوە چ بە (دابەزین یان بە دانەبەزین).

ئەو زانا پایەبەرزانەی کە دەفەرموون و باوەڕیان وەهایە کەخوای گەورە ئەو سفرە پڕ لە خواردنەی دانەبەزاندووە بەڵگەیان ئەوەیە کە دەفەرموون:

❁ کاتێ ئەو کەسانەی داوای ئەم سفرە پڕ لەخواردنەیان کرد گوێیان لەو فەرموودەی خوای گەورە بوو کە پێی فەرموون:

﴿اني منزلها عليكم فمن يكفر بعد منكم فاءني أعذبه عذاباً لا أعذبه أحـــد مـــن العـــالمين﴾ (المائده:١١٥).

واتە: من -خوای گەورە - دایدەبەزێنم بەسەرتانا ئەو سفرە پڕ لە خواردنەی کەداوای دەکەن بەڵام لەپاش ئەوە هەرکەس بێ باوەڕ بێتەوەو پشت بکاتە دینی من ئەوە سزادانێك سزای دەدەم کەکەس بەو جۆرە لە جیهاندا سزا نەدرێت و نەدرابێت.

ئا لەم کاتەدا (حسن ومجاهد) دەفەرموون:

(ئەم گەلە بە گوێ بیستی ئەم هەڕەشە توندە دەست بەجێ تەوبەیان کردو وتیان نامانەوێت).[١٦]

❁ بەڵام ڕاست ترین و پەسەند تریبن ڕاو بۆچوون لەسەر ئەم حاڵەتە ئەوەیە کە خوای گەورە سفرە پڕ لە خواردنەکەی بۆ دابەزاندن (کەئەمەش ڕاو بۆچوونی زۆربەی ئەو کەسانەن کە تەفسیری قورئانیان کردووە).[١٧]

ئەویش بەبەڵگەی ئەوەی کە خوای گەورە دەفەرمێت:

﴿ اني منزلها عليكم ﴾ (المائدة ١١٥).

واتە: من دایدەبەزێنم بەسەرتاندا.

---

(١٦) تفسير الكبير (فخر الدين الرازي ) ج/١٢ ( ص١٣٣).

(١٧) تفسيرالكبير (فخرالدين الرازي) ج/١٢ (ص: ١٣٣).

## چەند پەندو سەرنج دان و ئامۆژگاریەکی گرنگ لەباس و بەسەرهاتەکانی بەندی دووەم

١- حکمەت لە پێ دانی (معجزە) لەلایەن خوای گەورەوە بۆ پێغەمبەران بۆ چەند مەبەستێکی گەورەیە کە بریتین لە:

أ) بۆ مەبەستی سەلماندی ڕاستێتی خۆی وەك پێغەمبەرێك و هەڵبژاردەیەکی خوایی لەناو گەلەکەیدا، کە ئەمەش گەورەترین خاڵی لێکتر نزیك بوونەوەو تێگەیشتنە لەیەکتری.

چونکە گومانی تێدا نیە کەوا گەر پێغەمبەران چەند کارو فرمانێکی سەرسوڕهێنەر لەسەر دەستیان و بەدیارچاوی گەلەکەیانەوە ڕوونەدات ئەوە خەڵکی پشتیان تێ دەکەن و بەدرۆو ساختەکارو دەست بڕ ناویان دەبەن (والعياذ بالله).

ب) یەکێکی تر لە حکمەتەکانی (معجزة) بریتی‌یە لە جیاکردنەوەی پێغەمبەران لە خەڵکانی سادە، ئەویش بەوەی گەر پێغەمبەران (معجزە) و کاری لە ووزە بەدەر لە توانای مرۆڤەکانی تر لەسەر دەستیان ڕوونەدات ئەوە دەبێت چ جیاوازیەکیان هەبێت لەگەڵ کەسانی سادەو خەڵکی کۆمەڵگادا؟!

هەروەك چۆن کەسێکی خوێندەواری خاوەن بڕوانامەی بەرز بەهۆی بڕوانامەو خوێندەواریەکەیەوە جیا دەکرێتەوە لە کەسێکی نەخوێندەوارو بێ بڕوانامە، ئاوا بەهەمان شێوەش پێغەمبەران بەهۆی (معجزە) وە جیا کراونەتەوە لە کەسانی سادەو بێ (معجزە).

ج) گومانی‌تێدا نیە کە لەناو هەموو میللەتێکدا داب و نەریت و خویەکی تایبەتی هەبووە کە ئەو گەلە خویان داوەتێ و وەك (باوڕ) ی لێ هاتووە لەناویاندا، خوای گەورەش لەگەڵ باوی ئەو سەردەمەدا جۆرە (معجزە) یەکی بەخشیوە بەو نێردراوەی خۆی وەك (پێغەمبەرێك) کە کارێکی نامۆ نەبێت بەلای ئەو گەلەوەو پاشان بەهۆی ئەو معجزەیەشەوە لەبەرامبەریاندا بووەستێ (تەحەدایان بکات).

کە ئەمەش خۆی بۆخۆی واقعیەت ی سەرجەم دینەکانی خوای گەورە دەگەیەنێت.

د) یەکێکی تر لە حکمەتەکانی (معجزە) بریتی‌یە لە سەلماندنی هێزو دەستەڵاتی گەورەو بێ‌سنوری خوای گەورە بۆ ئەو میللەتانە.

بەڵێ بەڕاستی مرۆڤەکان لەچاو دەسەڵات و هێزی خوای گەورەدا زۆر لاوازوو بێ دەسەڵاتنو هیچیان پێ ناکرێت و زۆر جار بەهۆی سنورداری خۆیان انکاری لەو دەسەڵاتەی پەروەردگاریان دەکەن و ناچێت بە زێرییاندا کە خوای گەورە خاوەنی دەسەڵاتێکی بێسنورە.

هەر لەبەر ئەمەیە کە خوای گەورە لە ڕێگەی پێغەمبەرانیەوە نموونەیەکی زۆر سادەو کەم لە دەسەڵاتی گەورەو بێ سنوری خۆی نیشان ئەو گەل و میللەتانە نیشان دەدات و بەزمانی حاڵ پێیان دەڵێت:

((ئەی بەندەکانم دەزانم کەوا شەیتان گومانی ئەوەی لە دڵتاندا دروست کردووە کە خوای گەورە بوونی نیە (والعياذ بالله) یان گەر باوەڕیشتان بە بوونی خوای گەورە هەبێت ئەوە باوەڕتان بە دەسەڵاتی بێسنوری نیە، بەڵام باش ئاگادار بن و بڕوانن کەوا لەسەر دەستی نێردراوانی خۆمانەوە نموونەی چەند دەسەڵات و بەتوانای خۆمان تان بۆ دەردەخەین)).

پاشان بزانن کە ئەوەی پێغەمبەران ئەنجامی دەدەن وەك (معجزە) یەك ئەوە سەرجەم دەسەڵاتی ئێمە نی، بەڵکو دەسەڵاتی ئێمە زۆر لەوە گەورەترەو ئەوەی پێغەمبەران ئەنجامی دەدەن تەنها بەشێکی زۆر کەمو سادەو بچوکە لە دەسەڵاتی ئێمە.

هـ) خاڵێکی تر لە حکمەتەکانی (معجزة) بریتییە لە بڕینی بیانووو قسەی خەڵکی ج لە دنیاو ج لە دوارۆژدا.

گەر پێغەمبەران بەبێ پێبوونی (معجزە) ڕاستەوخۆ بچونایە ناو گەلەکانیانەوە ئەوە دەست بەجێ گەلەکانیان داوای بەڵگەیکیان لێ دەکردن لەسەر ڕاست گۆییان کە ئاخۆ ئەمانە پێغەمبەن؟ یان کەسی سادەن و خۆیان بەو شێوە نیشان دەدەن (ئەمە لەدنیادا).

پاشان لە قیامەتیشدا بۆ ئەوەی ئەو گەل و میللەتانە لە کاتی بەرەو دۆزەخ• بردنیان هاوار دەکەن و بڵێن:

((ئەی خوایە بۆ سزامان دەدەیت و بەرەو دۆزەخمان ، ڕاپێچ دەکەیت لە کاتێکدا کەسێك ت ناردە ناومان بەناوی پێغەمبەرەوە کە هیچ بەڵگەو نیشانەیەکی ڕاستی پێنەبوو لەسەر ئەوەی کە بی سەلمێنێت بۆمان کە پێغەمبەرەو کەسێکی سادەو درۆزن نیە)).

بەڵێ ئەمانەو دەیان خاڵیتر حکمەتن لەسەر پێدانی (معجزة) لەلایەن خوای گەورەوە بۆ پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام).

٢- گەر سەرنجێکی ووردی (معجزەکان) ی (عیسا) بدەین دەبینین کەوا لە کۆتایی دا دەفەرمێت:

﴿بـإذن الله﴾: واتە: بەیارمەتی خوای گەورە من ئەم کارانە دەکەم و ئەنجامیان دەدەم، بەڵێ، ئەمەش چەندین نهێنی گەورەی لە خۆ گرتووە کە بریتین لە:

أ) چاکردنەوەی کوێرو نەخۆشی پێست وەك (گول بوون) و دروست کردنی باڵندەیەك لە قوڕو پاشان زیندوکردنەوەی مردوو.. هتد، تەنها چەند کارێکن پەیوەستن بە خوای گەورەوەو سیفەتی پەروەردگاریەتی خوای گەورە دەسەلمێنن.

پاشان دەبێت ئێمەی شوێن کەوتەی ئەو زنجیرە پێغەمبەرانە باوەڕمان وابێت کە تەنها خوای گەورەیە کە شیفای مرۆڤەکان دەدات و کەس ئەو توانایەی نیەو ناشی بێت کە دەستەڵاتی تەواوی هەبێت لەبەرامبەر بەشیفادانی مرۆڤەکاندا لە کاتی نەخۆشیدا.

بەهەمان شێووەش کەس توانادار نیە بەسەر زیندووکردنەوەی مرۆڤەکاندا یان هەرگیان لەبەرێکی تردا و تەنها ئەم کارانە پەیوەستن بەپەروەرگارەوە.

ب) ناوبردنی وشەی (بـإذن الله) ئەوەمان تێ دەگەیەنێت و وەك مامۆستایەکی زۆر دڵسۆز فێرمان دەکات کە کاتێ کارێکمان ئەنجام دا ئەوە ئەنجامەکەی بۆ هێزو بازوو زیرەکی خۆمان نەگێڕینەوە بەڵکو بڵێین.

((بەفەرمان و ویست و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوای گەورە ئەم کارەم ئەنجام دا، گەر پەروەدرگارم ویستی لەسەر نەبوایەو فەرمانی پێ نەکردایە ئەوە هەرگیز نەم دەتوانی و دەستەڵاتی بەئەنجام گەیاندنیم نەبوو)).

بێگومان ئەمە بۆکارێکی خێرو چاکە خوازی، بەڵام بۆ کاری خراپ و بەدکاری (خوای گەورە) دەفەرمێت:

﴿ ان الله لايأمر بالفحشاء ﴾.

واتە: خوای گەورە فەرمان ناکات بەکاری خراپ و دزی و چەواشەکاری.

٣- ناو بردنی پێغەمبەری ئیسلام (عليه السلام) لە ئینجیلدا و مژدەدان بە گەلی بەنی ئیسرائیل تەنها پەیوەست نیە بە مرۆڤەکانی ئەو سەردەمەوە کە لەگەڵ (عیسا) دا ژیاون بەڵکو بۆ سەرجەم ئەو کەسانەن کە بەڕاستی خۆیان بە دۆست و شوێن کەوتەی (عیسا) دەزانن و دەڵێن ئێمە خۆشەویست و نزیکی (عیسا) ین و ئەو پەرتوکە ئاسمانیەی کەلەسەری دەڕۆین و بڕوامان پێی هەیە بریتیە لە (ئینجیل)!!

ئێمە بەو کەسانە دەڵێین:

بەڕاستی گەر ئێوە خۆتان بە شوێن کەوتەی (عیسا) و (ئینجیل) دەزانن ئەوە دەبێت بڕواشتان بەو پەیمانو ئامۆژگاریو ڕێنماییانە هەبێت کەلەسەر زمانی عیساوە بەفەرمانی خوای گەورە لە ئینجیلدا نوسراوە.

گومانی تێدا نیە گەورەترین شتێ کە ئینجیل ئاماژەی بۆ کردووەو هەڵگرانی لێ ئاگادار کردۆتەوە مەسەلەی هاتنی پێغەمبەری اسلامە کە بە (احمد) ناوبراوە.

ووشەی (احمد) یان (محمد) جیاوازی نیەو هەردووکیان لەیەك سەرچاوەوە هاتوون کە (حمد) ە.

لە ئینجیلی بەرنابادا بە شێوەیەکی زۆر ئاشکرا ناوی (محمد) هاتووەو تێدیدا نوسراوە کە عیسا (عليه السلام) دەفەرمێت:

﴿ومبشراً برسول يأتي من بعدي اسمه أحمد﴾.(١٨)

واتە: مژدەتان پێ دەدەم کە پێغەمبەرێك لەپاش من دێت بەناوی (احمد) ەوە.

پاشان ئەو کەسانەی کە بەناوی خاچ پەرستیو مەسیحیەت گەریەوە بڕواناکەن بەم فەرموودەیە کە لە (ئینجیل) ە کەیاندا هاتووە دەبێت بە چ حەقێك خۆیان بە دڵسۆزو شوێن کەوتەی (عیسا) بزانن‌و چۆن ڕوویان بێت‌و بڵێن ئێمە لەبەر ئەوە باوەڕ بە قورئان ناکەین چونکە شوێن پەرتوکی ئاسمانی خۆمان کەوتوین -کە ئینجیلە-!!؟

بەڵام گەر لە ڕاستی ئەم مەسەلەیە بکۆڵینەوە گاورە خاچ پەرستەکان ڕاست ناکەن‌و بەرژەوەندی پەرستیو ئارەزوگەریو نەفس‌و شەیتان پەرستی بواریان نادات کە لە ڕاستی مەسەلەو ڕوداوەکان بکۆڵنەوەو حەق بدۆزنەوە.

جێی داخ‌و خەفەتە کەوا لەپاش دەیان ساڵ بەسەر ئەم مژدە پێدانەدا لەلایەن عیساوە بە هاتنی (محمد) ی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) خەڵکێکی زۆرو ژمارەیکی کەم وێنە بە درێژایی مێژوو و تا ئێستاش شوێن ناهەق کەوتوون‌و لەزەلکاوی نەفامیو خاچ پەرستیدا نوقم بوون‌و سەریان لە خۆیان‌و دەیان‌و سەدان هەزار کەسی تریش شێواندووەو بەرەو چارەڕەشیو ماڵ وێرانی دنیاو قیامەتیان دەبەن!!

٤- کاتێ (عیسا) (عليه السلام) هەستی بە بێباوەڕی گەلەکەی کرد دەست بەجێ فەرمووی کێ یارمەتیم دەدات لەسەر دین داریو بانگ کردنی خەڵکی بۆ یەکتا پەرستیو بەرزکردنەوەی ئاڵای خواپەرستی؟!

(١٨) نظريات في انجيل برنابا (المبشر بنبوة النبي محمد (ﷺ)) محمد علي قطب (ص: ٣٩).

بەڕاستی ئەم ڕووداوە دەرسمان زۆر دادەدات و فێری گەورەترین شێوازی کارکردنمان دەکات بۆ ئیسلام.

بەڵێ لە دنیادا هیچ کارێك بەتەنها کەسێك ئەنجام نەدراوەو ئەنجامیش نادرێت چونکە سروشتی کارکردن لە دنیادا وەهایە کە دەبێت مرۆڤەکان بە کۆمەڵ و هەرەوەز دەست بدەنە کارکردن و ڕاپەڕاندنی کارەکانیان جا هەر چییەك بێت، بەڵێ بانگ کردنی خەڵکی بۆ لای اسلام و بانگەوازی کردن بۆ دینی خوای گەورە هەروا کارێکی ئاسان نیەو بە کەسێك یان چەند کەسێك ئەنجام نادرێت.

کەواتە زۆر پێویستە کەوا فێری ئەوە ببین کە بەکۆمەڵ کار بکەین وسەرجەم کارەکانمان (کۆمەڵ داری) پێوە دیار بێت بۆ ئەوەی ڕەحمەت و چاودێری و بەرەکەتی پەروەردگاری زیاتر بەسەردا ببارێت و ڕۆژ بە ڕۆژ لە بەهێزیدا بێت.

گومانیشی تێدا نیە کە کارکردن و قسەکردن و فکرو بۆچوونی کۆمەڵێك ڕاست ترو باشترە لە کاروقسەو فکرەو بۆچوونی تاکە کەسێك یان چەند کەسێکی کەم.

بەڕاستی ئەمڕۆ لەسەرتاسەری زەویدا دوژمنانمان هەر لە (جولەکەو خاچ پەرست و علمانی و سەرجەم جولە بێباوەڕەکان) ی تر یەکیان گرتووەو بە کۆمەڵ دژایەتی ئەهلی اسلام دەکەن و شەوڕۆژیان پێکەوە گریٚ داوە بۆ لەبار بردنو مراندنی بانگەوازی اسلامی لەهەموو جێگاو شوێنێکی ئەم سەر زەویەدا.

لەبەر ئەوە زۆر پێویستەو واجبی سەرشانی تاك تاکی خۆمانە کە ئێمەش بە کۆمەڵ یەك بگرین و لە سەنگەری دژایەتی‌یدا بین بەرامبەر دوژمنانمان چونکە ئەوان بە کۆمەڵ دژایەتی ئێمەی ئەهلی ئیسلام دەکەن.

گومانیشی تێدا نیە کەوا ڕاست ترین و دروست ترین کۆمەڵ کە مرۆڤی موسڵمان کاری تێدا بکات بریتی‌یە لەو کۆمەڵ و لایەنەی کە سەرچاوەی کاری خەباتیان لە (قورئان و فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) پێکهاتووەو تەنها بەوەش ڕازیین کە (الله) خوایان بێت و (ئیسلام) دەستوری ژیانیان بێت و (محمد) ڕابەرو پێشەوای سەرجەم کارێکی چاکەو خێریان بێت.

٥ - پاش ئەوەی هاوەڵەکانی (عیسا) (عليه السلام) پشت گیری خۆیان بۆ (عیسا) (عليه السلام) دەربڕی چەند قسەیەکیان کرد کە بریتی بوون لەمانە:

أ) ﴿آمنا با لله﴾

واتە: باوەڕمان هەیە بەپەروەردگارمان.

بەڕاستی باوەڕهێنان بە خوای گەورە تەنها خۆی لە چوار چێوەی باوەڕ بوونێکی سادەو ساکاری نێو دڵی مرۆڤەکاندا نابینێتەوە چونکە گەر وابێت ئەوە (ابوجهل و عتبە و شیبةوابو لهب ..هتد) کە ئایەتی: ﴿ قل يا أيها الكافرون ﴾ یان بەسەردا دەهاتە خوارەوەو بەبێ باوەڕ ناونەدەبرانو هەر لە دنیادا مژدەی دۆزەخ یان پێ نەدەدرا.

لە کاتێکیشدا باوەڕیان بەوە هەبوو کە خوای گەورە دروستی کردوونو لە ئاسمانەوە ڕزقو بارانیان بۆ دەبارێنێت.

کەواتە مەسەلەی باوەڕهێنان بەپەروەردگار زۆر لەوە گەورەترە کە هەندێ خەڵکی سادەو ساکار لێی حاڵی بوون.

کاتێ مرۆڤ دەڵێت (امنا باالله) ئەوە دەبێت تەنها بەپێی فەرمانەکانی ئەو هەڵسوکەوت بکاتو لەفەرمانی دەرنەچێ.

باوەڕبوون بە خوای گەورە دەبێت بێزەرانی لەسەرجەم کاری خراپ دوور بخاتەوەو چاودێری پەروەردگار بچێنێت لە ناخیاندا.

**ئەو کەسانەی کە دەڵێن باوەڕمان بە خوای گەورە هەیە دەبێت هەوڵ بۆ دووکاری زۆر گەورە و سەرەکی بدەن کە بریتین لە:**

۞ هەوڵ دان بۆ شکاندنو بێڕێزکردنو لەناو بردنی ئەو کەسانەی کە دژایەتی لەگەڵ خوای گەورەوئیسلامو موسڵمانان دەکەن.

۞ هەوڵ دانو تێ کۆشانو خۆبەخت کردن لە پێناوی بەرزکردنەوە ناوی خوای گەورەو خەڵك ئاشناکردن پێی.

سەرەنجامی ئەم دووخاڵە بەم شێوەیە دەردەچێت هەروەك هاوکێشەیەك:

((جعل كلمة الله هي العليا وكلمة الذين كفروا السفلى))

واتە: بۆ ئەو مەبەستەی کە ناوو وشەی خوای گەورە بەرزو بڵند بێتو ناوو وشەی بێباوەڕانیش نزمو سەر شۆڕبێت.

**ب)** ﴿واشهد بأنا مسلمون﴾

واتە: ئەی (عیسا) تۆش شاهیدیمان بۆ بدە لەسەر ئەوەی کە مل کەچین بۆ فەرمانەکانی خوای گەورە.

گەر سەرنجی ئەم ئایەتە پیرۆزە بدەین دەبینین کەوا وشەی (مسلون) ی تێدا هاتووە.

(ابوأعلى) ی مەودودی لە تەفسیی وشەی (ئیسلام) دا دەفەرمێت:

((الأنقياد والأمتثال لأمر الأمر ونهيه بلا اعتراض) وقد سمی دیننا با إلاسلام لأنه طاعة الله وانقياد لأمره بلا اعتراض).[١٩]

واتە: اسلام بەمانای پەیوەست بوون‌و خۆ تەسلیم کردن بەفەرمانی فەرمان دارێك، دێت چ بە کردن‌و چ بە نەکردن -بەبێ ئەوەی ناڕەزایی دەربڕێت، پاشان هەر بۆ ئەو مەبەستە دینی خۆشمان ناونراوە اسلام چونکە تەواوی گوێڕایەڵی‌و پەیوەست بوونی تێدایە بۆ فەرمانەکانی خوای گەورە بەبێ ناڕەزایی دەربڕین.

هاوەڵە بەرزەکانی (عیسا) (عليه السلام) کاتێ ووتیان موسڵمانین، بەو مانا فراوانە ووتیان کەبەتەواوی‌و بێ پێچ‌و پەنا خۆیان تەسلیمی پەروەردگاریان کردووەو بەڕاستی بونەتە بەندەو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی.

بەڵێ بەرهەمی خۆتەسلیم کردنە بە خوای گەورە کە دڵ ئارامت دەکات‌و لە پەژارە دوورت دەخاتەوە.

خۆ تەسلیم کردن بە خوای گەورەیە کەمرۆڤی باوەڕدار وەها لێدەکات بەرگەی ناڕەحەتی‌و ئازاری ستەم کاران بگرێت‌و تەنها بۆ ساتێکیش لەو دینەی خۆی کە بەهەڵگری دەزانێ پاش گەز نەبێتەوە.

ئەو کەسانەی کە خۆیان تەسلیمی پەروەردگاریان دەکەن هەرگیز توشی نەخۆشی دەروونی‌و (کە ئابە) نابن چونکە باوەڕیان بە قەدەرو فەرمانی بڕیار لەسەردراوی پەروەردگار هەیەو دەزانن کەوا لە پاش هەموو ناخۆشیەك خۆشی بەدوادا دێت ﴿ إن مع العسر يسرى ﴾.

مرۆڤەکان بەهۆی خۆ تەسلیم کردن بەخوای گەورە دەگەنە ئەو پلە بەرزەی کە باشترین ووتە لەسەر زمانیان بێتە دەرەوەو پەروەدرگاریش شاهیدی لەسەر چاکەو باشی ووتەکانی بدات.

﴿ ومن أحسن قولاً ممن دعا الى الله وعمل صلحاً وقال انني من المسلمين ﴾.

بەڵام زۆر بەداخ‌و پەژارەیەکی زۆرەوە ئەمڕۆ لە جیهاندا هەزاران هەزار خەڵك خۆی بە موسڵمان‌و شوێن کەوتەی اسلام دەزانێت‌و لە پێناسەکانیان نوسراوە (مسلم) بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەوەی (اسلام) قەدەغەی دەکات‌و بە کارێکی دزێو خراپەی دەزانێت، ئەمان ئەنجامی دەدەن‌و لەپاشاندا دەڵێن (اسلام) فەرمانمان پێدەکات.

---

(١٩) مبادئ الأسلام (ابي الأعلى المودودي) / الطبعة الرابعة . (ص: ٧).

بەڕاستی کردەوەو ڕەوشتی نزمی ئەو کەسە ناحاڵی و نەفامو دوڕاوانەیە کەبوەتە هۆکاری ناشرین کردنی اسلامو دوور کەوتنەوەی خەڵکی لێی هەر لەبەر ئەم خاڵەیە کە پیاوێکی بیانی لەپاش موسڵمان بوونی دەڵێت:

(الحمد لله الذي اراني الأسلام قبل ان أرى المسلمون).[٢٠]

واتە سوپاس بۆ ئەو پەروەردگارەی کە ئیسلامی نیشان دام پێش ئەوەی موسڵمانانم پێ نیشان بدات، چونکە گەر لەسەرەتادا هەڵگرانی اسلام بدیایە ئەوە هەرگیز موسڵمان نەدەبوومو زیاتر خۆم دوورە پەرێز دەگرت لە اسلام.

بەهەمان شێوەش فەیلەسوفی تازە موسڵمان بووی فەرەنسی (روجیه گارودی) دەڵێت:

(المسلون هم الذين ينفرون الناس عن الأسلام يقفون عقبة في سبيل الأسلام اغلظ حجاب يحجز الدول الغربية والدول المتقدمة عن الأسلام هم المسلمون).[٢١]

واتە: موسوڵمانان بونەتە هۆکاری ڕاونانی خەڵکی لە اسلام، پاشان موسڵمانان بونەتە گەورەترین بەربەستو پەردە لەبەردەم موسڵمان بوونی وولاتانی ڕۆژئاواو وولاتە پێشکەوتووەکانی تردا.

ئەمڕۆ گەورەترین کێشەی جیهانی ئیسلامیو ئومەتی ئیسلام بە گشتی بریتی‌نیە لەوەی کە ژمارەیان کەمە!! یان هەژارن، یان بەرنامەیان نیە کە لەسەری بڕۆن، یان کەوتبێتنە ئەو پارچە زەویانەی کە ووشکنو هیچ خێرو بەرەکەتێکی خوای گەورەی تێدا نەبێتو بەمەش ژێرخانی ئابووری‌یان ڕوخابێت!!؟!

نەخێر ئەمانە کێشەی ئومەتی ئیسلام نیە، بەڵکو گەورەترین کێشەی جیهانی اسلامی بریتی‌یە لەوەی کەخەڵکێکی زۆر هاتوونەتە ناو اسلامەوەو شەهادەتی اسلامیان داوەو پڕ بە دەنگ هاوار دەکەنو دەڵێن موسڵمانین موسڵمان.

بەڵام موسڵمانێکی بێزانست، بێ عەقیدە، بێفکری اسلامی، موسڵمانێک کە خامەکەی دەستی لەخزمەتی کفردا بەکار دەهێنێتو لە دژی اسلام دەنوسێ.

موسڵمانێك کەسەرجەم ڕەوشتو دابو نەریتێکی جاهلی تێدایەو دوورە لە یاساو بنەما ئیسلامیەکان.

---

(٢٠) هموم المسلم المعاصر (د. يوسف القرضاوي).

(٢١) هەمان سەرچاوەی پێشو.

موسڵمانێك كە یاسایەكی نەفامی پارێزەرێكی دور لە خوای بەلاوەگرنگ تر و پیرۆزترە وەك لە یاساكانی خوای گەورە.

﴿ فلا وربك لايؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم ثم لا يجـــدوا في أنفســـهم حرجاً مما قضيت ويسلموا تسليما﴾.

خۆشەویســـتان و ئیســـلام دۆســـتانی كـــورد لـــە كۆتـــایی ئـــەم خاڵـــەدا هەر ئەوەندەتان پێ دەڵێین كە:

ئاگاداری ایمان ی خۆتان بن و ئەوەی كە دەیڵێن و پاشان ئەنجامی دەدەن بەو ئیســـلامەی پێوانـــە بكـــەن كـــەخۆتان بەهـــەڵگری دەزانـــن و دەڵێـــن ئێمـــە گـــاور و جولەكە نین و موسڵمانین.

وە دڵنیاش بن لەوەی كە لە ڕۆژی دوایدا خوای گەورە زۆر بەتوندی حسابتان لەگەڵدا دەكات كە بەتەنها بە قسەو زمان وتبێتان موسڵمانین، بەڵام هیچ كردەوەیەكتان لە ئیسلام نەچووبیت و دوور بووبێت لە یاساكانی اسلام و گەوهەری اسلام:

﴿ فذكر انما انت مذكر ﴾.

ج) ﴿فاكتبنا مع الشاهدين﴾

واتە: ئەی پەروەردگارمان بمان نوسە لەگەڵ ئەو كەسانەی كە شاهیدی لەسەر تاك و تەنهایی تۆ دەدەن و دروشمی یەكتاپەرستی بۆ تۆ بەرز دەكەنەوە.

بەڵێ یەكێكی تر لە ووتەی هاوەڵەكانی (عیسا) (عليه السلام) ئەوە بوو كە فەرموویان:

﴿ فاكتبنا مع الشاهدين ﴾.

بەڕاستی هەر كەس بڕوای ببێ بە دینی خوای گەورە دەبێت و لەسەری واجبە كە شاهدی بدات لەسەر گەورەیی و ڕاستێتی ئەو دینە، بە جۆرێك كە هەوڵی گەیاندنی بدات و دەری ببڕێ كە بەتەنها دینی پەروەردگار كە پێك هاتووە لە (اسلام) ڕاستەو گونجاوە لەگەڵ هەمو كەس و سەردەمێكداو لەسەرجەم كەم و كوڕی و لاوازیەكەوە دوورە.

گومانیشی تێدا نیە كە ئەم شاهدیە هەروا ووتەیەكی سەر زووبانی مرۆڤەكان نیەو مەسەلەكە بەوەندە كۆتایی پێ نایەت و خۆی ناگرێت.

بەڵكو كاتێ شاهدیەكەی ڕاستەو لەلای خوای گەورە قبوڵەو پاداشتی لەسەر وەردەگرێت كە بەڕەوشت و كردەوەی چاك و خوا ویستانە ڕاستێتی ئەو شاهدیە بسەلمێنێت.

کەواتە پێویستی سەرشانی هەریەك لە ئێمەی موسڵمان ئەوەیە کە بەپێی توانا بکەوینە هەوڵ دان بۆ جێبەجێکردن و جێگیر کردنی ئەو دینە لە ژیانی خۆمان و خەڵکانی تریشدا.

پاشان دەبێت ئامادە بین و بەردەوام لە حاڵەتی ئامادەباشیدا بین بۆ خۆبەخت کردن و خوێن ڕشتن لە پێناوی ئەم دینەدا، بەڵێ هەر لەبەر ئەمەشە کە ئەو کەسانەی خۆ بەخت دەکەن لەم پێناوە پیرۆزەداو دەکوژرێن ناو دەبرێن بە –شەهید–.

٦- ڕووداوی داواکردنی سفرەیەکی پڕلە خواردن لەلایەن هاوەڵەکانی (عیسا) وە (علیه السلام) گەورەترین دەرس و پەندو ئامۆژگاریمان فێر دەکات کە بریتی یە لە:

((جیاوازی لە نێوان ئومەتی محمد (ﷺ) و ئومەتی (عیسا) (عليه السلام) یان جیاوازی لە نێوان هاوەڵەکانی (محمد) (ﷺ) و هاوەڵەکانی (عیسا) (عليه السلام):

خاوەنی تەفسیری في ظلال القرآن دەفەرمێت:

((انهم الحواريون الذين الهمهم الله الأيمان به وبرسوله عيسى فامنوا، واشهدوا عيسى على اسلامهم، ومع هذا فهم بعدما رأوا من معجزات عيسى مارأوا، يطلبون خارقة جديدة، تطمئن بها نفوسهم، ويعلمون منها انه صدقهم، ويشهدون بها له لمن وراءهم.

فأما اصحاب (محمد) (ﷺ) فلم يطلبوا منه خارقة واحدة بعد اسلامهم، لقد امنت قلوبهم واطمأنت منذ ان خالطها بشاشة الأيمان، ولقد صدقوا رسولهم فلم يعودوا يطلبون على صدقه بعد ذلك البرهان، ولقد شهدواله بلا معجزة الا هذا القران.

هذا هو الفارق الكبير بين حواريى عيسا (عليه السلام) وحواريي (محمد) (ﷺ)..)).[٢٢]

واتە: هاوەڵەکانی (عیسا) (عليه السلام) خوای گەورە ئیلهامی ئەوەی کردبوون کە باوەڕیان بەپەروەردگاریان و پێغەمبەرەکەی کە (عیسا) یە هەبێت و ئەوانیش باوەڕیان هێنا، وە (عیسا) شاهیدی بۆ دان لەسەر اسلامەتیان و خۆیەکلاکردنەوەیان بۆ خوایگەورە، پاشان لەگەڵ ئەم باوەڕهێنانەیانداو لەپاش بینینی چەندین (معجزه) و کاری سەرسوڕهێنەر لە عیساوە، داوای (معجزه) ە یەکی تازەتریان لێ کرد بۆ ئەو مەبەستەی کە دەروونیان ئارام بێت و پاشان شاهیدی لەسەر ڕاستێتی ئەم ڕووداوە بدەن بۆ کەسانی دوای خۆیان.

---

(٢٢) في ظلال القرآن (سيد قطب) ج/٣ (ص: ٧١-٧٢).

بەلام هاوەلەکانی (محمد) (ﷺ) تەنها (معجزة) یەکی وەهایان لە پێغەمبەر داوانەکرد لە پاش موسلمان بوونیان.

بەڕاستی هاوەلەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دڵەکانیان باوەڕی هێنابوور دڵ ئارامیان تێکەڵ باوەڕیان بوو بوو.

وەهەروەها پێغەمبەرەکەیان بە ڕاست دەزانی و نەدەگەڕانەوە سەر ئەوەی کە داوای کارێکی وەهای لێبکەن لەسەر ڕاستێتی پێغەمبەرەکەیان.

پاشان باوەڕیان بە پێغەمبەر (ﷺ) هەبوو بەبێ ئەوەی لە غەیری (قورئان) هیچ (معجزه) یەکی تر ببینن.

بەڵێ بەڕاستی ئەمەیە ئەو جیاوازیە گەورەیەی کە لەنێوان هاوەڵەکانی (عیسی)و هاوەڵەکانی (محمد) بەدی دەکرێت (عليه السلام).

٧- خوای گەورە لە وەلامی داواکاری هاوەڵەکانی (عیسا) دا فەرمووی:

﴿ اني منزلها عليكم فمن يكفر بعد منكم فاني أعذبه عذاباً لا أعذبه أحد من العالمين ﴾ (المائدة:١١٥).

واتە: ئەوا من ئەو سفرە پڕ لە خواردنە دادەبەزێنم بۆتان بەلام هەرکەسێك لەپاش ئەم ڕوودادە بێباوەڕ بێتەوە ئەوە ئازاردانێك ئازاری دەدەم کەکەس لە جیهاندا ئازاری وا نەدرێت و نەدرابێت.

بەڕاستی ئەم ئایەتە نهێنی و ئامۆژگاری و پەند وەرگرتنی زۆری لە خۆدا حەشار داوە بەلام ئەوەی زیاتر پەندی لێ وەربگرین لێرەدا باسی بکەین ئەوەیە کە بڵێین:

گەر سەرنجی ووردی هەڕەشەکەی خوای گەورە بدەین بۆ داواکەرانی ئەم سفرە پڕ لە خواردنە، سەیر دەکەین سزای خوای گەورە لەپاش ئەوە باس دەکرێت کە ئەم کارە ڕوبدات نەك پێش ڕوودانی.

بەڵێ ئەمە یاسای پەروەردگارە کەکەس لە خۆڕایی و بێ بنچینە سزا نادرێت لەلای خوای گەورە، بەڵکو سزادانی خەڵکی لەپاش بۆ ڕوون کردنەوەو بینینی ڕوداوەکان دێت، یان لەپاش هاتنی پێغەمبەران وەك ئاگادارکردنەوەی خەڵکی، هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿ وما كنا معذبين حتى نبعث رسولا ﴾.

واتە: ئێمە -خوای گەورە- ئازارو سزای هیچ گەل و کۆمەڵێك نادەین تا ئاگادار کەرەوەو نێردراوێکی خۆمانی بۆ نەنێرین.

کە ئەمەش بەڵگەی زۆر پتەوە لەسەر ئەوەی کە هەرکەسێ توشی ئازارو سزای خوای گەورە بوو چ لە دنیاو چ لە قیامەت ئەوە لەپاش ڕوون کردنەوەی دین و سەرجەم لایەنەکانی تری باوەڕدا بووەو بەبێ ئاگاداری دووچاری ئەم حاڵەتە نەبووە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ بەهاوەڵەکانی (عیسا) (عليه السلام) گەر هەرکەسێك لە ئێوە پاش دابەزینی ئەوسفرەیە بێباوەڕ بووەوە ئەوە زۆر بە توندی سزای دەدەم کەکەس بەو شێوەیە سزا نەدرابێت لە جیهاندا.

# بەندی سێهەم

## دوا ئامۆژگاری (عیسا) (عليه السلام) بۆ گەلەکەی

گومانی تێدانیە کەوا سەرجەم پێغەمبەران دوا ووتەو دوا ئامۆژگاری گەلەکانی خۆیان کردووەو ئاگاداریان کردوونەتەوە بۆ ئەو مەبەستەی کە لەدنیاو چ لەڕۆژی دوایدا تەنها بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەبێت لەسەر ئەوەی کەئاگادار نەکراونەتەوە هەروەك لەباسەکانی پێشودا ئاماژەمان بۆ کرد.

بەڵێ عیسا (عليه السلام) وەك نێردراوێکی خوای گەورە بۆلای جولەکەکان، وەك بەندەیەکی هەڵبژێردراوی خوا لەناو سەرجەم بەندەکاندا بۆ کاری پێغەمبەرایەتی، وەك رەحمەتێك بۆ ئەو گەلە دڵ رەق و رابووردوو پیسە، دوا ووتەو دوا ئامۆژگاریخۆی بۆ گەلەکەی بریتیبوو لەوەی کەپێی فەرموون:

((ئەی گەلەکەم پەروەردگارتان بپەرستن، ئەو پەروەردگارەی کەخوای من و خوای ئێوەشە، پاشان دڵنیابن لەوەی کەهەرکەس هاوەڵ و شەریك بۆ پەروەردگاری پەیدابکات ئەوە خوای گەورە بەهەشتی لێحەرام دەکات و بەدۆزەخی شاد دەکات،

پاشان کەکرانە ناو دۆزەخەوە هیچ کەسێك ناتوانێت یارمەتیتان بدات و لەو سزا سەختە ڕزگارتان بکات.

قورئان باسی ئەم ئامۆژگاریەمان بۆ دەکات و دەفەرمێت:

﴿ وقال المسيح يابني اسرائيل اعبدوا الله ربي وربكم انه من يشرك بالله فقد حـــرم الله عليه الجنة ومأواه النار وماللظالمين من أنصار ﴾ (المائده:٧٢)

واتە: (مەسیح) . عیسا (عليه السلام) ووتی: ئەی نەوەکانی (اسرائيل) ئەو خوایە بپەرستن، کەپەروەردگاری منیش و ئێوەشە، وەهەر کەسێك هاوەڵ و شەریك بۆ پەروەردگاری بڕیاربدات ئەوە خوای گەورە بەهەشتی لێحەرام دەکات و پاشان شوێن و جێگای ئەو کەسە دەبێت بەدۆزەخ، وەبۆ ستەم کاران نیە هیچ یارمەتی و سەرخەرێك لەڕۆژی دوایدا.

# دواساتی ژیانی (عیسا) (عليه السلام) لەناو گەلەکەیدا

سونەت و فەرمانی خوای گەورە وەهابووە کەپێغەمبەران تاماوەیەکی دیاریکراو لەناو گەلەکانیاندا بانگەوازی خوای گەورە بلأوبکەنەوەو دینی خوای گەورە بەوپەڕی دڵسۆزی و هەوڵ و تێکۆشانەوە پەخش بکەن و پاشان بگەڕێنەوە بۆلای خوای گەورە.

*گەڕانەوەی پێغەمبەرانیش بۆلای خوای گەورە تەنها بەیەك شێوە نەبووە بەڵکو چەند جۆر گەڕانەوەیەکمان هەیە لەکۆتا ژیانی ئەو پێغەمبەرە بەرێزانەوە ئاگاداربووین کەبریتین لە:*

أ - گەڕانەوەی ئەو پێغەمبەرە بەشێوەو ڕێگەی مردن وەك (ئادەم. نوح. موسا. هارون. محمد... هتد) سەلامی پەروەردگاریان لەسەربێت.

ب - گەڕانەوەو کۆتای ژیانیان بەشێوەی شەهیدبوون بەدەستی گەلە ستەم کارەکانیان وەك (زەکەریا) کەلەلایەن گەلەکەیەوە شەهیدکرا.

ج - گەڕانەوەو کۆتای ژیانی ئەو پێغەمبەرە بەشێوەی بەرزکردنەوەی بۆ ئاسمان و ڕزگارکردنی لەدەستی بەدکاری گەلە ستەم کارەکانیان، کەئەم ڕێگەیە جیاوازە لەو دوو ڕێگەی‌ترو گەر سەرنجی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (عليه الصلاه والسلام) بدەین ئەوە دەبینین کەوا ئەم کۆتا ژیانەی کەبەرزکراونەتەوە بۆ ئاسمان تەنها پەیوەستە بەژیانی (عیسا)وەو بۆ هیچ یەکێ لەو پێغەمبەرانەی تر باس نەکراوە.

بێگومان زانایان لەدەربارەی دواساتی ژیانی عیساوە (عليه السلام) ڕاو بۆچوونی جیاواز جیاوازیان هەیە.

ئەم ڕاوبۆچوونە جۆراوجۆرەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەبەشێوەیەکی دیارو ئاشکرا لەقورئان و فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەردا باس نەکراوە تەنها ئەوەندە نەبێت کەبەکۆمەکی خوای گەورە لەباسەکانی‌تردا ئاماژەی بۆ دەکەین.

بەڕاستی ڕاو بۆچوونەکان زۆرن و انشاالله باس لەهەموویان دەکەین و پاشان ڕاسترین بۆچونیان هەڵدەبژێرین و بۆچوونی خۆمانی لەدربارەوە باس دەکەین.

**بۆچوونی یەکەم:**

**زۆربەی زۆری ئەو کەسانەی کەقسەیان لەم بارەوە کردووە دەفەرموون:**

((کاتێ جولەکە وویستیان (عیسا) بکوژن دەست بەجێ خوای گەورە (عیسا)ی لەدەستیان ڕزگارکردوو بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان، لەم کاتەدا جولەکەکان ترسێکیان

لەنەفام و چەواشەکراوەکانی خۆیان بۆ دروست بوو چونکە جولەکەکان بەڵێنیان دابوو بەنەخام و نەخوێندەوارەکان کەدەبێت (عیسا) بکوژین و لەناوی بەرین.

لەم کاتەدا بۆ دروست نەبوونی گرژی و ئاڵۆزی لەنێوان جولەکەو نەفام و نەخوێندەوارەکاندا جولەکەکان هەڵسان بەکوشتنی کەسێك بەناوی (عیسا)وەو پاشان لەخاچیان داو ووتیان کەوا (عیسا)مان کوشتووە.

خەڵکیش کاتێ ئەم ڕوداوەیان بینی بڕوایان کرد چونکە بەدەم و چاو عیسایان باش نەدەناسی و دەیان زانی کەوا ئەوەی کوژراوەو لەخاچ دراوە عیسایە.[1]

## بۆچوونی دووەم:

وەك ئاشکرایە کە(عیسا) (عليه السلام) بۆ چەند ساڵێکی دیاریکراو لەناو گەلەکەیدا بانگەوازی کرد، ئەم بانگەوازکردنەی بووە هۆکاری بڵاوکردنەوەی ڕاستی و ئاشکراکردنی فێڵ و تەڵەکەبازی و خۆدەرخستنی جولەکەکان.

لەم کاتەدا جولەکەکان هەڵسان بەدانانی پیلان بۆ کوشتن و لەناوبردنی (عیسا) (عليه السلام)، جولەکەکان کاتێ لەپیلان دانانەکەیان بوونەوە هەڵسان بەئاگادارکردنەوەو تێگەیاندنی پادشای ئەو سەردەمەو داواکاریەکەیان بەساختەکاری خۆیان ڕازاندەوە.

بەڵێ لەپاشاندا پادشا فەرمانیکرد بەسەربازەکانی کەوا بچن دەست بەجێ (عیسا) بگرن، لەم کاتەدا خوای گەورە پیلانەکەی هەڵوەشاندنەوەو عیسای لەدەستیان ڕزگارکردو شێوەو ڕوخساری کەسێکی تری خستە سەر شێوەی عیسا کەلەئینجیلەکاندا بە (یهوذای اسخریوطی) ناسراوەو یەکێك بوو لەقوتابیە فێڵ بازو ساختەکارەکانی عیسا کەدووڕوبوو لەگەڵیدا.

کاتێ سەربازەکان (یهوذا)یان بینی بێگومان بوون لەوەی کەئەم کەسە (عیسا)یەو دەست بەجێگرتیان و کوشتیان و پاشان لەخاچیان دا.[2]

## بۆچونی سێهەم:

جولەکەکان. نەفرینی خوایان لێبێت. وەك بڕوایان بە (عیسا) (عليه السلام) نەکرد هەربەوەندە وازیان نەهێنا بەڵکو هەڵسان بەپیلان دانان بۆ لەناوبردنی (عیسا)و پاشان دروست کردنی پڕوپاگەندەو بوختان کردن بۆ (مەریەمی) دایکی، هەربۆ ئەم مەبەستە

---

(١) التفسير الكبير (فخرالدين الرازي) ج(١١) (ص: ١٠٠).

(٢) قصص الانبياء (عبدالوهاب بخان) (ص: ٤٢٢).

هەڵسان و جوولەکەکان چوونە لای پادشای ڕۆمانیەکان کەناوی (بیلاطس)بوو، شکاتیان لێکرد بەوەی کە (عیسا)(عليه السلام) خەڵکی تێك دەدات و چەواشەیان دەکات و سەرگەردانیان دەکات و فێری بەدکاری جادووبازیان دەکات، بێگومان بەم قسە درۆو بریقەدارو بێناوەرۆکانە کاریان کردە سەر پادشاو ڕێی پێدان کەوا چی دەکەن لەبەرامبەر عیسادا ئەنجامی بدەن.

پادشا زاتی ئەوەی نەبوو کەخۆی ڕاستەوخۆ دەست درێژی بکاتە سەر (عیسا) (عليه السلام) چونکە هیچ بەڵگەیەکی ڕاست و دروستی بەدەستەوە نەبوو.

لەم کاتەدا جولەکەکان بڕیاریان دا کەوا بیکوژن، هەر بۆ ئەم مەبەستە هەڵسان بەوەی کەچەند کەسێکیان کۆکردەوە کەبیکوژن، کەسێك بەناوی (یەهوذا)وە کەبەڕوکەش قوتابی عیسابوو و بەڵام ژێربەژێر یەکێك بوو لەپیلان دەرانی لەم کاتەدا (یهوذا) هەڵسا بەنیشان دانی ئەو جێگایەی کە(عیسا)ی تێدابوو.

کاتێ (یهوذا) چووە ژورەکەوە سەیریکرد کەوا (عیسا)(عليه السلام) لەژورەکەدا نەماوە ئەویش بەهۆی ئەوەی کەخوای گەورە لەپێش ڕودانی ئەم کارە بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان.

بەڵێ (یهوذا) لە ژورەکەدابوو بەفەرمانی خوای گەورە شێوەی چووە سەر شێوەی (عیسا)، (یەهوذا) بەم کارەی نەزانی کەوا دەنگ و ڕەنگی وەك دەنگ و ڕەنگ و شێوەی (عیسا)ی لێوەهاتووە، پاشان (یەهوذا) بێئومێدبوو ولەژوورەکەی (عیسا) هاتە دەرەوەو ووتی:

(عیسا)(عليه السلام) لەوێنیە، کاتێ سەرۆکی سەربازەکان چاوی بە(یەهوذا) کەوت دەست بەجێ وای زانی کەعیسایە، هەربۆیە فەرمانیدا بەرگرتن و پاشان بەکوشتنی.

لەم کاتەدا (یەهوذا)ی ناپاك و دووڕوو ووتی من (یەهوذا)م سەرۆکی سەربازەکانیش ووتی (ئەگەر تۆ عیسا) نیت ئەی کوا (عیسا)!!؟

(یەهوذا)ش ووتی: باشە گەر من عیسا (بم) ئەی (یەهوذا) کوا؟!

بەڵێ خوای کارجوان ئابەو جۆرە (عیسا)ی پاراست و (یهوذا)ی ناپاکیش دنیاو دوارۆژی خۆی لەدەست دا (خسر الدنيا والاخرة)[٣]

## بۆچوونی چوارەم:

(ابن جریر) دەفەرێت: (عیسا)(عليه السلام) لەگەڵ (٧٠) لەهاوەڵەکانی هاتنەوە بۆ ئەو جێگایەی کەمەبەستیان بوو. واتە. بۆ ماڵەوە، لەم کاتەدا چواردەوری ئەو ماڵەگیرا کە(عیسا و هاوەڵەکانی تێدابوو، پاشان بەفەرمانی خوای گەورە ڕوخساری هەموویان چوەسەر ڕوخساری (عیسا)(عليه السلام).

(٣) تەفسیری قورئانی پیرۆز (مامۆستا مەلا عوسمان عبدالعزيز) بەرگی (٢) لاپەرە (١٤٧)

لەم کاتەدا ئەو کەسانەی کە ووستی کوشتنی (عیسا)یان هەبوو خۆیان کرد بەژووردا بەلام دیمەنێکی زۆر سەرسوڕهێنەریان بینی کەئەویش بریتی بوو لەوەی هەموویان وەك یەك وابوو و شێوەو ڕوخساریان وەك (عیسا)ی لێهاتبوو.

سەربازەکان ووتیان ئەمە جادووە لەئێمەتان کردووە، گەر ئاگادارمان نەکەن لەوەی کە(عیسا) کامەیە ئەوە هەمووتان دەکوژین.

(عیسا)(عليه السلام) فەرمووی (من يشري نفسه منكم بالجنه؟!

واتە: کێ لەئێوە ئەمڕۆ نەفسی خۆی دەفرۆشێ بەبەهەشت؟! یەکێ لەو (٧٠) کەسە ووتی (من) پاشان لەو ژوورەی کەتێیدابوون ڕۆیشتە دەرەوەو ووتی من (عیسا)م، دەست بەجێ لەلایەن بکوژانیەوە گیراو کوشتیان و پاشان لەخاچیان دا.

ئابەم کارە گومانیان وەهابوو کەعیسایان کوشتوەو پاشان گاورەکانیش هەمان بۆچوونیان هەیە. بەلام خوای گەورە عیسای ڕزگارکرد لە دەستیان و بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان،[٤]

**خۆشەویستان ئەم چەند بۆچوونەی بۆمان باس کردن هەریەکەیان بۆچوونی زانایەکی بەڕێزەو پاشان لەکۆتایی ئەم باسەدا پێمان باشە کەوا ڕاو بۆچوونی خۆمان وەك نوسەرێك باس بکەین و بڵێین.**

١ - گومان لەوەدانیە کەجولەکەکان (عليهم اللعنه) خواستی کوشتنی عیسایان هەبوو و پاشان ئەنجامیشیان دا بەلام لەبەرامبەر (عیسا)دا نا، بەڵکو لەبەرامبەر کەسێکی تردا کەلەو دەچوو، هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿وقولهم انا قتلنا عيسى ابن مريم رسول الله...﴾ (النساء: ١٥٧)

واتە: جولەکەکان بەگاڵتەو تەشەردانێکەوە دەڵێن: ئێمە (عیسا)ی کوڕی مەریەممان کوشت کەپێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوی خوا بوو.

٢ - ئەو کەسەی جولەکەکان کوشتیان (عیسا) نەبوو(عليه السلام) بەڵکو کەسێکی تر بوو کەلە(عیسا) دەچوو وبکوژانی سەریان لێشێوا لەکاتی کوشتن و لەخاچ دانیدا هەروەك خوای گەورە دەفەرمێت:

﴿وما قتلوه وما صلبوه ولكن شبه لهم﴾(النساء: ١٥٧)

واتە: (عیسا) نەکوژراوەو نەلەخاچ دراوە بەڵکو وێنەی (عیسا)یان نیشان درا نەك عیسا خۆی.

---

(٤) تفسير القران العظيم (ابن كثير) ج(١) ص(٥٨٨)

٣ - بەدڵنیاییەوە ئێمە باوەڕمان وەهایە کە (عیسا) (عليه السلام) نەکوژراو خوای گەورە بەرزی کردەوە بۆ لای خۆی لە ئاسمان هەروەك دەفەرمێت:

﴿ بل رفعه الله اليه ﴾ (النساء: ١٥٨)

واتە: بەڵکو خوای گەورە بەرزی کردەوە بۆلای خۆی.

٤ - چۆن کەسێ لەوە دڵنیایە گەردەستی کرد بەناو ئاگردا دەسوتێ، ئێمەش ئاواو زیاتر لەوە باوەڕمان وەهایە کە(عیسا) (عليه السلام) نەکوژراوەو لەخاچ نەدراوە هەروەك خاچ پەرستو جولەکەکان باوەڕیان وەهایە کە(عیسا) هەر لەدنیادا لەخاچ دراوەو کوژراوە.

خۆ ئەگەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین لەدەربارەی کوشتنو لەخاچ دانی عیساوە ئەوە زۆر بەتوندی بەرپەرچی ئەم مەسەلە دەداتەوەو سێجار بەدوای یەکدا دڵنیامان دەکات کەعیسا نەکوژراوەو لەخاچ نەدراوە هەروەك دەفەرمێت:

أ ) ﴿وما قتلوه﴾ واتە: بەهیچ شێوەیەك (عیسا) نەکوژراوە.

ب ) ﴿وماصلبوه﴾ واتە: بەهیچ شێوەیەك (عیسا) لەخاچ نەدراوە.

ج ) ﴿ وماقتلوه يقينا ﴾ واتە: بەیەقینو بێدروست بوونی گومان (عیسا) نەکوژراوە.

هەڵوێستەیەك!! بەڕاستی کاتێ مرۆڤی باوەڕدارو ژیر دەگات بەخزمەتی ئەم جۆرە ئایەتانەی خوای گەورە تەزولە بسەرجەم لاشەیدا دێت لەڕاستێتیو گەورەی ئەم ئایەتانە.

دەبینین کەوا خوای گەورە کەخاوەنی عیسایە، ئاگاداری سەرجەم ڕوداوەکانە، دروست کەری سەرجەم بونەوەرە، فەرمان بەدەستوبەڕێوەبەری گەردوونە، شاهیدی دیارو نادیارە، ڕاست ڕەو و ڕاست بێژە ئەگێڕانەوەی بەسەرهاتو ڕوداوەکاندا.

بەڵێ خوای گەورە ئاگاداری سەرجەم رووداوەکانەوبە مرۆڤەکان ڕادەگەیەنێتو پێیان دەفەرمێت:

ئەی بەندەکانم!!

أ - من پەروەردگاری ئێوەو سەرجەم مرۆڤو دیارو نادیارەکانم لەم گەردوونەدا. پاشان ئێوە دروست کراوێکی تەمەن کورتو ناتەواونو سیفەتی . کمال تان تێدانیە.

ب — ئەی بەندەکانم ئێوە دروست کراوی دەستەڵاتی منن —پەروەردگار- سیفەتی لاوازیو بێدەستەڵاتی زۆر زاڵە بەسەرتاندا بەتایبەتی سیفەتی بیرچوونەردو هەڵە گێڕانەوەی هەواڵەکان بەتایبەتی هەواڵی مێژووی چونکە ئێوە لەچاو مێژوودا تەمەنتان زۆر کورتەو ئەوەی لەمێژووە بەرگوێتان کەوتووە تەنها بەچەند ڕێگەیەك بووە.

**یەکەم:** یان لەدەمی خەڵکی‌ترەوە وەرتان گرتووە، لەم حاڵەتەشدا مەرج نیە کەوا ئەو خەڵکەی ئەو زانیاریەی پێداون ڕاست گۆبێت!! یان ئەگەر ڕاست گۆش بێت ئەوە بەهۆی سیفەتی لەبیرچوونەوەو زۆر دەرك نەکردن بەحەقیقەتی ڕوداوەکان بەکەم‌و کوڕی‌و لاوازی ئەو هەواڵانەتان پێدەگەیەنن!!

کەواتە دڵ نیابن لەوەی کەئەو هەواڵە مێژووییانەی کەپێتان گەیشتووەو بەتایبەتی لەدەربارەی (عیسا)وە (عليه السلام) ئەوە زۆربەی هەڵەیەو لەگەڵ ڕاستیدا دژایەتی هەیە.

بەڵام ئەوەی من –واتە خوای گەورە– پێتان ڕادەگەیەنم دەقاودەقی مەسەلەکانە و چەوتی‌و لارو وێری‌و درۆی تێدانیە چونکە خۆم ئاگاداری‌بووم‌و لەڕێگەیەکی ترەوە ئەو زانیاریەم لەدەربارەی مەسەلەو ڕووداوەکانەوە وەرنەگرتووە. هەروەك قورئان شاهیدی ئەم مەسەلەیەو دەفەرموێت:

﴿ نحن نقص عليك نبأهم بالحق ﴾ (کهف: ١٣).

واتە: ئەی محمد ئەم دەنگ‌و باسەت بەڕاستی بۆ باس دەکەین کەدووربێت لەهەموو درۆو هەڵەیەك.

یان دەفەرمێت:

﴿ماكان حديثاً يفترى ولكن تصديق الذى بين يديه وتفصيل كل شـــيء وهـــدى ورحمة لقوم يؤمنون﴾ (یوسف:١١١)

واتە: ئەم قورئانە قسەو هەواڵی درۆو دروست کراو نیە، بەڵکو ڕاست گێڕوو ڕوون کەرەوەی ئەو نامەیە کەلەپێش ئەوە هاتووە پاشان ڕوون کەرەوەی هەموو شتێکە، وە ڕێنومێ‌و سۆزو ڕەحمەتە بۆ ئەوانەی کەباوەڕیان پێ هێناوە.

**دووەم:** یان بەشێوەی نوسین‌و خوێندنەوە پێتان گەیشتووە کەئەمیش لەلایەن چەند کەسانێکەوە نوسراوە کەخاوەنی هەڵەن‌و زۆرجاریش بێ‌وویژدانی زۆرو شاردنەوەی ڕاستیەکان دەکەنە بناغەی باسەکانیان.

**بەڵێ بەڕێزان ئێستاو لەم کاتەدا دەتوانین کەبڵێین: پێگەیشتنی هەواڵە مێژووییەکان بەنێمە لەدوو ڕێگەی سەرەکیەوە کەبریتین لەمانە:**

**أ- الوحي:**

واتە نیگا لەلایەن خوای گەورەوە بەهۆی فریشتەیەکیەوە بۆ سەر دڵی پێغەمبەرەکەی‌و ئاگادارکردنەوەی لەڕاستی‌و دروستی ئەو هەواڵە.

*گومانیشی تێدانیە کەوەحی لەلایەن پەروەردگارەوەیەو پەروەردگاریش دەیان و سەدان سیفەتی تێدایە کەبریتین لە*

- ڕاست ڕەوی تەواو لە مەسەلەکاندا.
- خوای گەورە سیفەتی لەبیرچونەوەی نیە تاوەکو بەشێك لەو هەواڵەی کەدای دەبەزێنێ کەم وکورت بێت و جۆرە ناتەواویەکی پێوەدیاربێت. ﴿وما كان ربك نسيا﴾.
- خوای گەورە ئاگاداری تەواوی هەیە بەسەر ڕودانی سەرجەم کارو مەسەلەکاندا، جائەو کارانە بەئاشکرا ئەنجام درابێت یان بەنهێنی ئەوە بەلای زانستی بێ سنوری خوای گەورەوە وەك یەك وەهایە. ﴿عالم الغيب والشهادة﴾.
- خوای گەورە گوێبیستی سەرجەم قسەی بەندەکانیەتی لەهەموو کات و جێگایەکداو پاشان چاوی لەهەموو هەڵسوکەوتێکیانەو لێی غافڵ نیە. ﴿ان الله سميع بصير﴾.

**<u>ب- لەڕێگەی غەیری وەحی:</u>**

هەروەك باسمان کرد یەکێکیتر لەو ڕێگە سەرەکیانەی کەدەبێتە هۆکاری گواستنەوەی هەواڵ و ڕوداوەکان بریتین لەمرۆڤەکان.

بەڵێ هەروەك چۆن خوای گەورە چەند سیفەتێکی هەبوو کەهەندێکی مان لێ باس کرد، ئاواو بەهەمان شێوەش مرۆڤیش چەند سیفەتێکی هەیە کەپێی دەناسرێتەوە بەڵام دەبێت ئاگاداری ئەوەبین کەهیچ سیفەتێکی مرۆڤ لەسیفەتی پەروەردگار ناچێت ﴿ليس كمثله شيء﴾.

*بێ گومان مرۆڤیش لەم چەند سیفەتە پێکهاتووە:*

- مرۆڤ سروشتی وەهایە کەلایەنی بیرچونەوەی تێدایەو زوو هەواڵەکانی بیردەچێتەوەو لەپاش ماوەیەك ناتوانێت ئەو ڕوداوە واقعیەی کەلەبەرچاویدا دیوەیەتی وەك خۆی باسی لێوەبکات.

بەڵێ ئەمە بۆ ڕووداوێك کەخۆی ئاگاداری بێت و ئامادەی بووبێت ئەوە حاڵیەتی ئەی ئەگەر بۆی باس بکەن و ماوەیەکی زۆریش ی بەسەردا ڕۆیشتبێ ئەوە دەبێت ئەو هەواڵە چەندی بەڕاستی مابێت؟!!

- هیچ کەسێکی ژێر گومانی لەوەدا نیە کەمرۆڤەکان بەگشتی سیفەتی ناتەواوی لەپێکهاتەی لاشەو ژیریاندا هەیە، ئەم لایەنەش کاریگەریەکی زۆری هەیە لەسەر گواستنەوەی هەواڵەکان، کەزۆرجار بێویژدانی و درۆ ڕەوی و شاهیدی دانی درۆ لەباس کردنی هەواڵەکانیدا بەدی دەکرێت.

- تەمەنی مرۆڤەکان لەدنیادا بۆماوەیەکی دیاری کراوەو پاش ئەوماوە دیاریکراوە دەمرن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەمرۆڤەکان توانای ئاگاداربوونو شاهیدی دانی تەواویان نیە بەسەر هەواڵو مەسەلەو ڕوداوەکاندا.

بەڵێ ئێستا بابێنو ویژدانی خۆمان بکەینە دادوەرێکی ڕاست ڕەو بۆ پێوانەکردنی هەواڵەکانو بڵێین.

((پاش ئەوەی زانیمان کەوا پەروەردگار سەرجەم سیفەتی بەرزیو گەورەیو تەواوی تێدایەو قابیلی هەڵەو لەبیرچوونەوەو هەڵە گواستنەوەی ڕوداوەکانیە، کەواتە لەم کاتەدا هەواڵ لەپەروەردگار وەربگرین لەرێگەی (وەحیە)وە باشترو ڕاست ترە؟! یان لەدەمی مرۆڤەکانە!!؟!

خوای گەورە کەخاوەنی عیسایەو پەروەردگاریەتیو ئاگاداری سەرجەم ژیانیەتی دەفەرمێت: ((دڵنیابن لەوەی کەعیسا بەندەی منەو پاشان نەکوژراوەو لەخاچ نەدراوە))!!

هەندێ کەسی دور لەخواو بێباوەڕیش بەتایبەتی (جولەکەو گاور) دەڵێن ((نەخێر عیسا کوژراوەو لەخاچ دراوە))؟!

سەرنج بدە،!! خوی گەورە دەفەرمێت (عیسا نەلەخاچ دراوەو نەکوژراوە بەڵام مرۆڤە بێباوەڕو تەمەن کورتەکانیشدەڵێن: نەخێر ئەی خوایە ئێمە لەتۆ باشتر ئاگاداری ئەم مەسەلەینو عیسا کوژراوەو پاشان لەخاچ دراوە!!) (والعیاذ بالله)

بەڕاستی سەرگەردانیو ژێری لەدەست دانە بۆ مرۆڤەکان کەزانستی کاڵو کرچو سنورداری خۆیان پێش زانستی فراوانو بێسنوری پەروەردگاریان بخەن لەکاتێکدا خوای گەورە دروست کەرو بەدیهێنەری سەرجەم بوونەوەرەو زانستی بێسنوری بەرابوردوو و داهاتوی دروست کراوەکانی خۆی هەیە، لەگەڵ ئەمەشدا مرۆڤەکانیش خاوەنی تەمەنێکی کورتو زانستێکی سنوردارو ژیریەکی ناتەواون.

لەکۆتای مەسەلەی لەخاچ دانو دواساتی عیسادا دەڵێین:

ئێمە وەك شوێن کەوتەی قورئان باوەڕمان وەهایە کەخوای گەورە چی فەرمووە لەم بارەیەوە ئەوە ڕاستەو غەیری ئەمەش درۆیەو چەواشەکردنی خەڵکە.

هەروەها گەر کەسێك یان کۆمەڵێك بیروباوەڕێکی دژی فەرموونەی خوای گەورەیان هەبێت لەبارەی لەخاچ دانو دواساتی عیساوە ئەوە بەبیروباوەڕی ئێمەی ئەهلی (سونەتو جەماعەت) لەئیسلام پێی دەچێتە دەرەوەو پێی (کافردەبێت).

هەروەك باسیشمان كرد ئێمە باوەڕمان وەهایە كە (عیسا) لەلایەن جولەكەی بەدكارو بێباوەڕەوە پیلانی كوشتنی بۆ دانرێژرا بەڵام خوای گەورە بەهێزو دەستەڵاتی بێسنوری خۆی لەدەستی چەپەڵی بكوژانی ڕزگاری كردوو بردیەوە بۆ ئاسمان.

لەگەڵ ئەمەشدا هەركەس باوەڕی وەهابێت كەعیسا كوژراوە ئەوە بادڵنیابێت لەوەی كەبێباوەڕ بووە (كافر).

پاشان هەركەسێك باوەڕی وەها بێت كە(عیسا) (عليه السلام) لەخاچ داروە ئەوە ئەم جارەشیان بادڵنیابێت لەوەی كەلەئیسلام چووەتە دەرەوەو بێباوەڕبووە (كافر).

چونكە گومانی تێدانیە كەئەگەر هەر بیروباوەڕێك دژی فەرموودەی خوای گەورە بێت ئەوە ڕاست نیەو هەڵگرانیشی پێی بێباوەڕو گومڕاكەردەبن.

﴿ وقولهم انا قتلنا المسيح عيسى ابن مريم رسول الله وماقتلوه وماصلبوه ولكن شبه لهم وان الذين اختلفوا فيه لفي شك منه مالهم به من علم الا اتباع الظن وماقتلوه يقينا بل رفعه الله اليه وكان الله عزيزا حكيما ﴾ (النساء: ١٥٧ . ١٥٨)

## گفتوگۆیەكی زانستی لەمانای ووشەی (ئینجیل)و (ئینجیل) خۆی

ئەو پێغەمبەرانەی كەبە (رسول) ناوبراون لەقورئاندا بریتین لەوانەی كەخوای گەورە پەرتوكی ئاسمانی پێخەڵات كردوون.

بەڵێ یەكێ لەو پێغەمبەرانەی كەلەقورئاندا ناوی خۆیو پەرتوكە ئاسمانیەكەی براوە بریتیە لە(عیسا)ی كوڕی مەریەم (عليه السلام).

خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿ وءاتيناه الانجيل فيه هدى ونور.... ﴾ (المائدة: ٤٦)

واتە: ئینجیلمان بەخشی . بێگومان بەعیسا . كە تێیدا ڕونكایو ڕێنموێی.

## پێناسەی ووشەی (ئینجیل)

ووشەی (ئینجیل) مانای مژدەدان (البشارة) دەگەیەنێت.

بەڵێ مژدەدان بەوەی كە(ئینجیل) بریتیەلە ڕووناكی و ڕێنموویی مژدەدان بەگەلی بەنی ئیسرائیل بەوەی كەلەدوای (عیسا)(عليه السلام) پێغەمبەرێكیتر دێت بەناوی (احمد)ەوە.

پاشان ڕێنموێی كردنی بەنیئیسرائیل بەوەیكەپەروەردگاریان بپەرستنو هاوەڵیبۆ پەیدانەكەن. هەروەك لەسەرتادا باسمان كرد كەوا ئەو پێغەمبەرانەی كە بە (رسول) ناویان هێنراوە لەقورئاندا ئەوە لەلایەن خوای گەورەوە پەرتوكی ئاسمانیان

پێبەخشرلوە بەهەمان شێوە (عیسا)ش یەکێبوو لەو پێغەمبەرە ئازیزو خاوەن ڕێزانەی کەوەك (رسول)ێك لەلایەن پەروەردگارەیەوە (پەرتوکی) ئاسمانی بەناوی(ئینجیل)ەوە پێخەڵات کرا.

هەروەك ئاشکراشە کەوا (ئینجیل) لەسەردەمی (عیسا)دا (عليه السلام) کۆمەڵێك لەقوتابیە نزیکەکانی هەڵسان بەنوسینەوەی (ئینجیل)و کۆکردنەوەی لەپەرتوکێکی سەربەخۆدا.

بەڵام سەیر لەوەدابوو کەخوای گەورە کاتێ باسی (ئینجیل) دەکات بە(تاك) (مفرد) باسی دەکاتو دەفەرمێت: ﴿ وآتيناه الانجيل ﴾ (المائدة: ٤٦)

واتە: ئێمە ئینجیلمان پێبەخشی. لەگەڵ ئەمەشدا نافەرمێت ﴿ وءاتيناه الاناجيل!!﴾

واتە: ئێمە ژمارەیەکی زۆرمان لە(ئینجیل) پێبەخشی!!

بەڵام لەپاش (عیسا) ژمارەی (ئینجیل)ەکان لەدانەو دوانەدا نەما بەڵکو کار زۆر لەوەگران تربوو و ڕێژەی (ئینجیل)ەکان زۆر زۆر بو تا پیاوانی کەنیسە هەڵسان بەهەڵبژاردنی چواریانو پاشان سوتاندنو لەناوبردنی ئەوانیتر.

ئەو ئینجیلە دەست نوسانەی کەهەڵبژێردراون ومتمانەیان پێکران بریتیبون لە (مرقص . متى . يوحنا . لوقا).

بەڵێ هەریەك لەم (ئینجیلانە)ی کەناوبراون بەدەستی قوتابیو کەسە نزیکەکانی (عیسا)وە نوسرانەوە، پاشان لەلای سەرجەم خاچ پەرستەگاورەکانی دنیا متمانەی تەواوی پێدەکرێتو زۆر بەپیرۆزەوە ناویان دەبرێتو باسی دەکرێت.

لەگەڵ ئەم چوار (ئینجیل)ەدا کەسێکیتر بەناوی بەرناباوە هەڵسا بەنوسینی (ئینجیلێکی)ترو ناسرا بە(ئینجیلی بەرنابا)، لەم ئینجیلەدا زۆر بەئاشکرا باسی ئەوە دەکات کەپاش عیسا(عليه السلام) پێغەمبەرێکیتر دێت بەناوی (احمد)ەوە.

خاچ پەرستەگاورەکان هەڵسان بەبەرپەرچ دانەوەو دژایەتیو سوکایەتی کردن بەم (ئینجیل)ەو ڕایان گەیاند کەوا متمانە بە(برنابا) ناکرێت!!

ئەمەش لەبەرئەوە نەبوو کە بەرنابا لەنوسینی (ئینجیل)ەکەیدا درۆزن بووە یان بەهەڵە ژیانو وتەکانی عیسای نوسیوە!! بەڵکو لەبەرئەوەبوو کەلەگەڵ بیروباوەڕی دەست کاری کراوی گاورە خاچ پەرستەکاندا نەدەگونجاو دژایەتی ئاشکرای لەگەڵ سەرجەم بنەمای (ئینجیل)ەکانیتردا هەبوو.

سەرنج بدە! گاورە خاچ پەرستەکان تەنها لەبەرئەوە دژایەتی ئینجیل ی بەرنابا دەکەن چونکە ڕاستی تێدا باس کراوەو مژدەی داوە بەهاتنی پێغەمبەری (ئیسلام) کە(محمد)ە (صلى الله عليه وسلم).

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئینجیلەکان لەنێوان خۆشیاندا دژایەتی ئاشکرا یان هەیەو لەزۆربەی مەسەلەو باس و ڕوداوەکاندا دژی یەکترن!!

کەئەمەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەئەو ئینجیلانەی ئێستا هەن و لەلایەن گاورەکان و خەڵکێکی نەفام و چەواشەکراوەوە متمانەی پێدەکرێت درۆن و قسەی پەروەردگار نین و هەڵبەستراوو دروست کراوی دەستی مرۆڤەکانن، گەر نابۆچی ژمارەیان چوارەو یەك دانە نیە؟! گەر ئینجیلەکانی ئێستا ڕاستن و قسەی مرۆڤ نین ئەی بۆچی دژایەتی لەنێوانیاندا هەیە؟!

خۆ ئاشکرایە کەوا خوای گەورە تەنها یەك (ئینجیل)ی دابەزاندوەو یەك جۆر قسەی تێدا فەرمووە!!!؟

گومانیش لەوەدا نیە کەووتەکانی خوای گەورە دژایەتی یەکتری ناکەن و لەهەموو هەڵەو ناتەواوی و دژایەتی و کەم و کوڕیەکەوە دوورن.

وەبەپێچەوانەشەوە ووتەکانی خوای گەورە پشت گیری یەکتری دەکەن و نمونەیان وەك بەرنامەیەکی داڕێژراوو حساب بۆکراو وەهایە تەنها ووتەیەکی خوای گەورە نابینن کەپێچەوانەی یەکتربێت.

## کەواتە ئێستا گەیشتینە ئەو ڕاستیەی کەبڵێین:

١- خوای گەورە تەنها یەك (ئینجیل)ی سپارد بەعیسا (عليه السلام) بەڵام لەپاشاندا ژمارەی ئەو تەنها (ئینجیل)ە گەیشتە (٧٠،٨٠) وەزیاتریش کەئەمەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر دەست کاری کردنی (ئینجیل)و فڕێدانی ووتەکانی خوای گەورەو دانانی ووتەی (مرۆڤ) لەجێگەکەیدا.

٢- گومان لەوەدا نیە کەئەو (ئینجیلانەی) کەئێستا هەن درۆن و زۆر دوورن لەو تەنها (ئینجیل)ەی کەخوای گەورە سپاردی بەعیسا، دژایەتی نێوان چوار ئینجیلەکە لەدەربارەی ڕووداوو مەسەلەکان بەڵگەن لەسەر ئەم ڕاستیە.[٢] گاورە خاچ پەرستەکان خۆیان شاهدن لەسەر ئەوەی کە (ئینجیل) نوسراوی مرۆڤە نەك خوای گەورە، هەربۆیە کەسێکی وەك (جراهام سکروجی).

کەڵانایەکی زۆر گەورەی (بروتستانت)ە لەکتێبی (هل الكتاب المقدس كلام الرب) لەژێر ناونیشانی (كتاب من صنع البشر ولكنه سماوي) دەڵێت:

(نعم، ان الكتاب المقدس من صنع البشر با لرغم من أن البعض جهلا منهم قد انكروا ذالك)[٥]

واتە: بەڵێ ئەم کتێبە پیرۆزە کە ( ئینجیل)ە دروست کراوی دەستی مرۆڤە، لەکاتێکدا هەندێ کەسی نەفام ئینکاری لەم ڕاستیەدا دەکەن!!.

٤- کارێکی زۆر ئاساییە کەئەو ئینجیلانەی بەدەستی مرۆڤ نوسرابێت هەڵەی تێدابکرێت!! بەڵام ئایا چەند هەڵە؟! دانەو دوان!! نەخێر (٥٠) هەزار هەڵە!! لەگۆڤاری (استيقضوا) واتە (هەڵسن‌و ئاگاداربن) کەساڵی (١٩٥٧) دەرچوو، لەسەر باسێکی سەربەخۆداو لەلاپەڕە(١٢) نوسرابوو.

(خمسون الف خطأ في الكتاب المقدس)[٦]

واتە: پەنجا هەزار هەڵە لەکتێبی پیرۆزدا . انجيل ..

بەڕاستی زۆر تاوانێکی گەورەیە کەوا ئەم (ئینجیل)ە دەست نوسانەی ئێستا کەهەن بەهی خوای گەورەی بزانن‌و باوەڕیان وەهابێت کەخوای گەورە دای بەزاندون هەروەك تەورات‌و قورئان ......))

چونکە ڕەوانیە و ژیری قبوڵی ناکات کەوا خوای گەورە بەیەك جارو لەپەرتوکی ئاسمانیدا (٥٠) هەزار هەڵە تۆماربکات‌و ڕەوانەی بەندەکانی بکات!! بۆ مەبەستی ڕێنیشان دان‌و ئامۆژگاری کردنی بەندەکان.

## هەڵوێستی ئیسلام دەربارەی (ئینجیل)

ئیسلام وەك کۆتا پەیامی خوای گەورە بۆ مرۆڤەکانی سەر زەوی بەگشتی هەڵوێستی تایبەتی هەیە دەربارەی هەموو مەسەلەو ڕوداوێك‌و پێناسەو هەڵسەنگاندنی سەربەخۆی لەبارەیانەوە هەیە.

بەڵێ هەر لەم ڕوانگەیەوە هەڵوێستی ئیسلام دەربارەی (ئینجیل) بەتایبەتی بریتیە لەوەی کەباوەڕی وەهایە کەپەرتوك‌و پەیامی خوای گەورە بووەو بۆ گەل بەنی

---

(٥) هل الكتاب المقدس كلام الله؟! (احمد ديدات)

(٦) هل الكتاب المقدس كلام الله؟! (احمد ديدات)

ئیسرائیلەکان (جولەکە) دابەزیو پاشان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لەسەر زەوی مایەوە، بەڵام فەرمانو داواکاریەکانی (ئینجیل) تەنها پەیوەست بوو بەگەلێکی دیاریکراوی وەك (جولەکە)وەو پەیامێکی گشتی نەبوو بۆ سەرجەم مرۆڤەکانی سەر زەوی.

پاشان ئێمەی موسڵمان کەشوێن کەوتەی ئیسلامین بەهەمان شێوە باوەڕمان بەوە هەیە کە(ئینجیل) پەرتوكو پەیامی خوای گەورەبوو بۆ گەلی بەنی ئیسرائیلو وەك خەڵاتێکی ئاسمانیش بەخشرا بە(عیسا)ی کوڕی مەریەم (عليه السلام).

﴿ والذين يؤمنون بما أنزل اليك وما أنزل من قبلك.... ﴾ (البقرة:٤)

بەڵام لەپاش (عیسا) (عليه السلام) (ئینجیل) لەلایەن قوتابیو کەسە نزیکەکانی خۆیەوە نوسرایەوەو زۆرێك لەوتەکانی خوای گەورە فڕێدرانو پشت گوێخرانو لەجێگەکەیدا قسەی قەشەو پیاوانی کەنیسەی تێدا نوسراو پاشان عیساو مەریەمی دایکیشی کران بەخوای دووەمو سێهەمو حەقی پەروەردگارێتیان پێبەخشرا (سبحانه وتعالى عما يشركون))، وەباوەڕیشمان وەهایە کەئەو ئینجیلانەی ئێستا هەنو لەلایەن پیاوانی کەنیسەو خەڵکێکی تری نەفامو چەواشەوە متمانەی پێدەکرێت درۆنو دەست نوسی خەڵکینو زۆر دورن لەو ئینجیلەی کەخوای گەورە لەسەردەمی خۆیدا دای بەزاند بۆ عیساو گەلەکەی.

پاشان گەر کەسێك سوربێت لەسەر ئەوەی کەئنجیل دەست کاری نەکراوەو سەرجەم باسەکانی وتەی خوای گەورەن ئەوە پێی دەڵێن.

(گەر لەحاڵەتێکدا ئینجیل دەست کاریش نەکرابێت!! ئەوە بەدڵنیاییەوە بەهاتنی قورئان ئینجیلو سەرجەم پەرتوکە ئاسمانیەکانیتر سڕانەوەو کاریان نەماو دروست نیە بۆ کەس لەدوای هاتنی قورئان کار بەهیچ بەرنامەو یاساو دینێکی تربکات چونکە قورئان دوا پەیامو خەڵاتی خوای گەورە بوو بۆ سەرجەم مرۆڤەکان بەگشتیو بێ جیاوازی.

کەواتە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەبڵێین:

لەبەردوو هۆکاری سەرەکی ئێمەی موسڵمانو شوێن کەوتەی قورئان باوەڕمان بەم ئینجیلانە نیەو متمانەیان پێناکەین چونکە:

أ - لەبەرئەوەی کەئینجیل دەست کاری کراوەو لەبری وتەکانی خوای گەورە قسەی قەشەو پیاوانی کەنیسەی زیاتر تێدا نوسراوەتەوە.

کەبەڕاستی لەم کاتەدا دەتوانین بەئینجیل بڵێین پەرتوکێکی دەست نوسی دەستی مرۆڤ هەروەك سەرجەم پەرتوکەکانی‌تر، نەك ناوی بەرین بەپەرتوکێکی ئاسمانی کەلەلایەن خوای گەورەوە دانرابێت.

ب - هەروەك باسمان کرد بەهاتنی قورئان هەموو شەریعەت‌و دینەکانی پێش خۆی سڕانەوەو کاریان نەما، (ئینجیل)یش یەکێکە لەو دین‌و شەریعەتانەی کەلەپێش ئیسلامدا هەبوون‌و بەهاتنی ئیسلام سەرجەم یاساکانی هەڵوەشانەوەو کاریان نەما.

کەواتە بەپێی ئەم یاسایە (ئینجیل) کاری پێناکرێ‌و لەریزی نەبواندا حسابی بۆ دەکرێت.

وەهەر کەسیش کاربە یاساو دەستورەکانی (ئینجیل) بکات ئەوە زۆر بەدڵ نیاییەوە گومڕایەو پێی تاوان باردەبێت چونکە لەگەڵ جێبەجێ‌کردنی یاسایەکی (ئینجیل)دا بێ‌فەرمانیەکی خوای گەورە تۆمار دەکات.

## سیفەتەکانی ئینجیل‌و باس کردنی لەقورئان دا

بێگومان کاتێ خوای گەورە ئینجیلی وەك بەرنامەو پەرتوکێکی ئاسمانی دابەزاند بۆ عیساو گەلەکەی پێنج سیفەتی سەرەکی تێدابوو کەبریتی‌بوون لە:

١- ﴿هدىً﴾: یەکێ لەهەرە سیفەتە بەرچاوو گەورەکانی (ئینجیل) بریتی بوو لەڕێ‌نیشان دان‌و ڕێ‌نموویی کردنی گەل بەنی ئیسرائیل لەهەموو ئەو ڕێگایانەی کە بەرەو تاریکی دنیاو دواڕۆژیان دەبات.

٢- ﴿نور﴾: دووەم سیفەتی ئینجیل بریتی‌بوو لەڕووناکی ئەویش بەومانایەی کەڕووناك کەرەوەی دڵە تاریکەکان‌و ڕێگەڕەشەکان دێت کەسەرەنجامەکەی بەدۆزەخ‌و ڕقی خوایی کۆتای پێدێت.

٣- ﴿مصدقا لمابين يديه من التـــوراة﴾: بەو مانایەی کەشاهیدی بدات لەسەر ڕاستێتی تەورات کەلەپێش ئینجیلدا بووەو پاشان (ئینجیل) تەواوکەری شەریعەتی (موسا) بووە تەنها لەهەندێ یاسادا نەبێت کەبەهاتنی عیسا () هەندێك لەو شتانەی کەبەپێی شەریعەتی تەورات لێیان حەرام بوو بۆیان حەلاڵ بوو هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿ ولاحل لكم بعض الذى حرم عليكم ﴾

واتە: بۆتان حەلاڵ دەکەم هەندێ لەوشتانەی کەلێتان حەرام کراوە.

٤- ﴿هـدى﴾: بۆ جاری دووەم خوای گەورە لەسفەتی چوارەمی (ئینجیل)دا باسی ڕێنمویی مان بۆ دەکات، کەئەم دووبارە کردنەوەیەی ووشەی (هدی) لەوەسفی سیفەتەکانی (ئینجیل)دا ئەوە دەگەیەنێت کەبەڕاستی هۆکاری هیدایەت بووەو شوێن کەوتوانیشی (مهتد) واتە هیدایەت دراوو دۆزەرەوەی ڕێی ڕاستو بەهەشت بوون.

٥- ﴿موعظة﴾: پێنجەم سیفەتی (ئینجیل) بریتیبوو لەئامۆژگاری بۆ گەلی بەنی ئیسرائیل لەسەرجەم ئەو سیفەتە دزێو خراپانەی کەبەردەوام ئەنجامیان دەدا.

## ڕوون کردنەوەو سەرنجێك لەدەربارەی سیفەتەکانی ئینجیل

هەروەك باسمان کرد کەوا ئینجیل (پێنج) سیفەتی سەرەکی پێدرا لەلایەن خوای گەورەوەو پاشان دووجار سیفەتی (هدی)ی تێدا دووبارە کرایەوە، بەڵێ خوێنەری خۆشەویست ئەو ئینجیلەی کەخاوەنی سەردارترین سیفەتی هیدایەتو ڕوناکیو ڕێنیشاندانو ڕۆشن کەرەوەی شەوە تاریکەکانی ژیانی مرۆڤ بوو لەسەردەمی عیسادا (عليه السلام)، بەڵام لەپاشاندا بەهۆی دەستکاری کردنی مرۆڤە سەرکەشەکانەوە پێچەوانەبویەوەو سەرجەم سیفەتەکانی بەزیندوێتی کرانە ناو گۆڕەوەو لەبری بەخشینی ڕووناکی تاریکی لێدەکەوتەوەو لەبری هیدایەت دانی شوێن کەوتوانی بوبەگەورەترین هۆکاری سەر لێشێوانو گومڕای هەڵگرانو شوێن کەوتوانی چونکە ووتەکانی خوای گەورەی تێدا لابراو ووتەی قەشەو پیاوانی کەنیسەو کەسانی بەکرێگیراوی جولەکەی تێکەڵ کراو فەرموودەکانی خوای گەورەی تێدا سڕایەوە.

ئیمامی (فخرالدین ی ڕازی) لەتەفسیری ئەو پێنج سیفەتەی (ئینجیل)دا دەفەرموێت:

١- لەدەربارەی ﴿هدى﴾وە دەفەرمێت:

((ان الانجيل هدى بمعنى انه اشتمل على الدلائل الدالة على التوحيد والتنزيه، وبراءة الله عن الصاحبة والولد والمثل والضد، وعلى النبوة وعلى المعاد... هتد).

واتە: (ئینجیل) هیدایەتە بەو مانایەی کەبەڵگەیە لەسەر یەکتاپەرستیو بەپاك دانانی خوای گەورە لەهاوڕێو منداڵو هاوشێوەو دژ، پاشان لەسەر پێغەمبەرایەتیو گەڕانەوە بۆلای خۆی...))

٢- لەدەربارەی ﴿نور﴾ەوە دەفەرمێت:

((فالمراد به كونه بيانا للأحكام الشرعية ولتفاصيل التكاليف))

واتە: مەبەست لە﴿نور﴾ ئەوەیە کە(ئینجیل) ڕون کەرەوەو ڕۆشن کەرەوەی حوکمە شەرعیەکانەو پاشان فراوان باس کردنی ئەو تەکلیفە شەرعیانەی کەتێدایە.

٣- لەدەربارەی ﴿مصدقا لما بين يديه من التوراة﴾ ئەوە دەگەیەنێت:

کە(ئینجیل تەواوکەورو پاڵپشتی بەهێزی شەریعەتی تەوارت بووە بەڵام لەهەندێ مەسەلەی حەڵاڵو حەرامدا کەمێك جیاوازی هەبووە کەئەویش هەندێ شت لەسەردەمی موساداو لەشەریعەتی تەوراتدا حەرام بوون لەسەر گەل (بەنی ئیسرائیل)، بەهاتنی عیساو دابەزینی (ئینجیل) لەلایەن خوای گەورەوە هەندێ لەو حەرامو قەدەغەکراوانە حەڵاڵ کرانو ئەو حوکمەی کەلەتەوراتدا هاتبون دەربارەی ئەو حەرامانە حەڵاڵ کران.

((ولِاحِلَ لكم بعضَ الذى حرُم علَيكم))

٤- لەدەربارەی ﴿هدى﴾وە بۆجاری دووەم دەفەرمێت:

((واما كونه هدى اخرى فلأن اشتماله على البشارة بمجئ محمد (صلى الله عليه وسلم) سبب لاهتداء الناس الى نبوة محمد (ﷺ))).

واتە: مەبەست لەباس کردنی (هدی) بۆ جارێکیتر بریتیە لەمژدەدان بەهاتنی پێغەمبەری ئیسلام (محمد) (ﷺ) وەك هۆکارێکی هیدایەت دانی خەڵکی بە پێغەمبەرایەتی (محمد) (ﷺ).

٥- لەدەربارەی ﴿موعظة﴾ دەفەرموێت:

((واما كونه موعظة فَلاِ شتِماله(الانجيل) على النصائح والمواعظ والزواجر البليغة المتاكدة))(٧)

واتە: لەبەرئەوە ئینجیل ئامۆژگاریە چونکە سەرجەم بواری ئامۆژگاریو پەندو سودی لەخۆگرتووەو دڵنیای لەسەر کردۆتەوە.

## گفتوگۆی نێوان خوای گەورەو عیسا (عليه السلام) لەڕۆژی دواییدا:

خوای گەورە باش دەزانێ کەوا ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی سەرلێشێواو و چەواشەکراو باوەڕیان وابووە کە(عیسا) (عليه السلام) بە(خوا)یان کوڕی (خوا)(والعياذ بالله) زانراوەو ناوی براوەو لەعەقیدەیاندا چەسپاوە کە(عیساو دایکی) (عليه السلام) خوای دووەمو سێهەمن. سبحانه وتعالى عما يشركون.

(٧) تفسير الكبير (فخرالدين الرازى) ١٢٥

لەرۆژی دوایدا خوای گەورە بۆ بەدرۆخستنەوەو هەڵوەشاندنەوەی ئەو عەقیدە بەتاڵ و دۆزەخیەو سەلماندنی ڕاستیّتی پەروەردگاریّتی خۆیو بەندایەتی سەرجەم دروست کراوەکانی خۆی، عیسا بانگ دەکات و گفتوگۆی لەگەڵدا دەکات و چەند پرسیارێکی لێدەکات و پێی دەفەرێت:

((ئەی عیسای کوڕی مەریەم تۆ بەخەڵکیت ڕاگەیاندوە کەخۆت و دایکت بەدووخوا بزانن لەغەیری ئەو خوایەی کەناوی (الله)یە؟!

عیساش لەوەلأمدا دەفەرمێت:

((پاکو بێگەردی بۆ تۆ ئەی پەروەردگار لەوەی کەمن بانگی خەڵکیم کردبێ بۆ ئەم کارە ناپەسەندەو پێم ڕاگەیاند بێتن کەمن و دایکم بەخوا بزانن!!

ئەی پەروەردگارم گەر من قسەی وام کردبێ ئەوە خۆت ئاگاداری حاڵی منیت و من ئاگاداری نهێ‌یەکانی تۆ نیم، بەڕاستی تۆ ئاگاداری هەموو نهێنیەکیت. قورئان لەم بارەیەوە دەفەرمێت:

﴿ واذ قال الله ياعيسى ابن مريم ءأنت قلت للناس اتخذونى وأمى إلهَين من دون الله قال سبحانك مايكون أن أقول ماليس لى بحق ان كنت قلته فقد علمته تعلم مافى نفسى ولاأعلم مافى نفسك أنك أنت علام الغيوب﴾ (المائدة: ١١٦).

واتە: خوای گەورە بەعیسای کوڕی مەریەمی فەرموو: ئەی عیسا تۆ بەخەڵکیت وتووە کەمن و دایکم دابنێن بەدووخوا جگەلە (الله)؟!

عیسا لەوەلأمدا دەفەرمێت پاکوبێگەردی بۆ تۆ ئەی پەروەردگارم چونکە ناگونجێ و دروست نیە بۆمن کەقسەیەك بکەم ڕاستنەبێت و شیاونەبێت، پاشان گەر من ئەو قسەیەم کردبێ و بەخەڵکیم ڕاگەیاندبێ کەمن و دایکم بەخوا بزانن ئەوە تۆ ئاگاداری ناخ و دەرونی منی بەلأم ئاگاداری نهێنیەکانی لای تۆنیم.

ئەی پەروەردگارم بەڕاستی هەرزاتی بەرزی تۆ زانایە بەسەرجەم کارە نادیارو نهێنیەکان.

پاشان قورئان باس و گفتوگۆکەی نێوان خوای گەورەو عیسا کۆتای پێ‌ناهێنێت و دەفەرمێت:

﴿ ماقلت لهم إلاّ ماامرتنى به أن اعبدوا الله ربى وربكم وكنت عليهم شهيدا مادمت فيهم فلما توفيتنى كنت الرقيب عليهم وأنت على كل شيء شهيد (١١٧) ان تعذبهم فانهم عبادك وان تغفرلهم فإ نك انت العزيز الحكيم ﴾ (المائده: ١١٧ـ١١٨)

واتە: عیسا فەرمووی ئەی پەروەردگارم: من هیچم نەگوتووە بەوان واتە: بەگەلەکەم . تەنها ئەوەندەنەبێت کەتۆ فەرمانت پێکردووم کەئەویش بریتییە لەوەی کەپێم ڕاگەیاندون ئەو (الله)یە بپەرستن کەپەروەردگاری منو ئێوەیە، پاشان من . واتە عیسا . ئاگادارییان بووم تائەو کاتەی لەناویاندا بوومو بەپێی فەرمانی تۆ ئەی خوایە ڕێنمویێم کردوون.

پاشان کاتێ کەمنت لەناویاندا وون کردوو بەرزت کردمەوە بۆ ئاسمان هەر زاتی خۆت چاودێرو ئاگاداربوویت بەسەریاندا، وەبەڕاستی ئەی پەروەردگارم گەورەیت ئاگاداری هەموو کارێکە، گەر سزایان بدەیت لەسەر ئەو تاوانو لادانەیان ئەوە ئەوانە بەندەی خۆتن، وەئەگەر خۆش دەبیت لێیان ئەوە بەڕاستی تۆ زۆر خاوەن غیرەتو بەدەستەلاتو کار جوانیتو سەرجەم کارەکانت لەشوێنی خۆیدا ئەنجام دەدەیت.

## حوکمی ئیسلام دەربارەی گاورە خاچ پەرستەکان

ئیسلام وەك کۆتا بەرنامەی خوای گەورە بۆ بەندەکان خوێندنەوەو حوکمی تایبەتی هەیە لەبەرامبەر هەموو مەسەلەو ڕێبازو تاکە کەسانی نێو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لەگەڵ ڕەچاوکردنی تایبەتی جۆری کەسەکانو کاتی ژیانو شوێنی کارکردنیان.

بەڵێ هەروەك باسمان کرد کەوا هەموو شتێك لەئیسلامدا حوکمی تایبەتی خۆی هەیە وەیەکێ لەو کۆمەڵەی کەئیسلام حوکمی دەربارەیان داوە بریتین لەوکەسانەی کەخۆیان بەشوێن کەوتەی (عیسا) دەزانن!!و بەخۆیان دەڵێن (مەسیحی) یان (گاور).

### حوکمی ئیسلام دەربارەی (گاور)کان بەم جۆرەیە:

١- بەپێی یاسای ئیسلام وەهایە کەهەر کەسێ باوەڕی وەهابێت کەخوای گەورە تەنها نیەو لەبری خوایەك چەند خوایەکیتر هەیە لەبوونەوەردا ئەوە بەدڵنیاییەوە پێی بێباوەڕو(مشرك) دەبێت چونکە بڕیاردانی خوایەکیتر لەگەڵ خوای گەورە یان بڕیاردانی کوڕو نەوە بۆ خوای گەورە لەگەڵ ناوو سیفەتو خوایەتی خوای گەورەدا ناگونجێتو ئەم بیروباوەڕە شەیتانیە دژی سەرجەم ناوو سیفەتەکانی خوای گەورەو یاساکانی قورئانە.

لەگەڵ ئەوەشدا دژی سروشتی مرۆڤەکانە کەچەند خوایەك هەبن لەبوونەوەرداو گەردوون بەڕێوەبەرن.

بەڵێ بەڕێزان بەپێی ئەم یاسایەی سەرەوە کەباسمان کرد گاورەکان (کافرن) وەلەگەڵ ئەوەشدا (مشرکن) چونکە باوەڕیان وەهایە کەتەنها (الله) خوانیەو بەڵکو

(عیساو مەریەم)ی دایکیشی دوو خوایترن. (سبحانه وتعالى عما یشرکون) وەهەندێکیتر لەگاورە خاچ پەرستەکان باوەڕیان وەهایە کە(عیسا) کوڕی خوایە (والعیاذ بالله)، قورئان لەدەربارەیانەوە دەفەرمێت:

﴿ لقد كفر الذين قالوا ان الله هو المسيح ابن مريم قل فمن يملك من الله شيئا ان اراد ان يهلك المسيح ابن مريم وامه ومن في الارض جميعا﴾ (المائدة: ١٧)

بەڵێ: بێباوەڕبوونو لەدینی خوای گەورە دەرچوون ئەو کەسانەی کەوتیان (الله) یەکێکە لەسێ خواکە. واتە. (الله، عیسا، مەریەم) وەهیچ خوایەك نیە تەنها یەك خوا کە(الله)یە، خۆئەگەر بێباوەڕان کەئاوا دەڵێن وازنەهێنن لەو قسە بێناوەڕۆكو تاوانکارییەیان ئەوە بەدڵنیاییەوە دووچاری سزایەکی زۆر سەخت دەبن.

بەڵێ ئەمانەو دەیان ئایەتیتر لەقورئاندا ئاماژە بۆ ئەو ڕاستیە دەکەن کەئەو مەسیحیە خاچ پەرستانەی باوەڕیان وەهایە کەعیساو مەریەمی دایکی دوو خوایترن _ والعیاذ بالله. ئەوە بەدڵنیاییەوە پێی بێباوەڕدەبنو لەلای خوای گەورە هەمان حوکی شەیتانیان هەیە.

پاشان باوەڕی گاورە خاچ پەرستەکان بەبوونی خوای گەورە ئەم حوکمە هەڵناوەشێتەوەو لەوبێ باوەڕییەیان ڕزگاریان ناکات چونکە بێباوەڕبوونی مرۆڤەکانو دەرچونیان لەدین تەنها ئینکاری کردنیان نیە لەبوونی خوای گەورە،

بەڵکو سەدانو هەزاران ڕێگا هەن کەوا مرۆڤەکان بەرەو بێباوەڕی دەبەنو لەدین دەیان کەنە دەرەوە.

***کەواتە پوختەی ووتە لەخاڵی یەکەمدا ئەوەیە کەبڵێین:***

هەر کەسێك باوەڕی وەهابێت کەلەغەیری خوای گەورە چەند خوایەکیتریش هەن بەهاوشێوەی خوا، ئەوە بێباوەڕدەبنو لەدین دەردەچن کەگاورە خاچ پەرستەکان ئەم باوەڕە هەڵەو بێناوەڕۆکەیان هەیە.

٢- لەڕوویەکیتریشەوە گەر حساب بکەین گاورەکان بێباوەڕن، ئەویش بەمەی کەباوەڕیان بەپێغەمبەری ئیسلام نیە.

باوەڕ نەکردن بەپێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) یەکێکە لەهەرە گوناهوو تاوانە گەورەکان کەمرۆڤ بەرەو کەلاوەی بێباوەڕی دەبات و لەدین دای دەڕنێ هەروەك چۆن خوری و پێست لەمەڕێك دابڕنێ.

پاشان زانایانی ئیسلام سەرجەم لەسەر ئەو ڕایەن کەهەرکەس باوەڕی بەخوای گەورە هەبێتو باوەڕی بەپێغەمبەرایەتی پێغەمبەر نەبێت ئەوە بەدڵنیاییەوە کافر بووە.

٣- گاورەکان (مشرکن) ئەویش بەپێی ئەو یاسایەی کەهەر کەس باوەڕی وەهابێت لەغەیری خوای گەورە خوایتر هەیە لەم بونەوەرەدا ئەوە پێی (مشرك) دەبێت.

بەڵێ گاورەکان باوەڕیان وەهایە کەخوای گەورە تەنها نیە بەڵکو (عیسا)و(مەریەم)ی دایکیشی دوو خوایترن لەم بوونەوەرەدا.

مشرکەکانی سەردەمی پێغەمبەری (ﷺ) باوەڕیان بەپەروەردگارێتی خوای گەورە هەبوو بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کڕنوشیان بۆ دەیانو سەدان بتو دروست کراوی دەستی خۆیان دەبردو باوەڕیان وەهابوو کەخوای ئاسمانو خوای زەویو خوای بارانو خوای ڕەشەباو خوای ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوا هەیەو بەهەمویان بوونەوەر بەڕێوەدەبەن!!

بەڵێ لەیاسای نەگۆڕو بڕیار لەسەردراوی ئیسلامیدا هەرکەسێ باوەڕی وەهابێت کەخوا تەنها نیەو چەند خوایەکی هاوئاستو هاوکاری خوای گەورە هەیە ئەوە بەدڵ نیاییەوە پێی (مشرك) دەبێت.

کەگاورەکان ئەم یاسایەیان بەسەردا جێبەجێ دەبێت چونکە باوەڕیان وەهایە کەخوای گەورەو عیساو مەریەم خوان لەبونەوەردا. سبحانه وتعالى عما يشركون.

٤- گاورەکان نەفامن (جاهل) چونکە ئەوان باوەڕیان وەهایە کە(عیسا) خوایەو هەندێکیتریان دەڵێن نەخێر عیسا کوڕی خوایە هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿ وقالت النصارى المسيح ابن الله ﴾ (التوبة: ٣٠)

واتە: گاورەکان دەڵێن مەسیح. عیسا. کوڕی خوایە.

نەفامی گاورەکان لەوەدایە کەدەڵێن (عیسا) خوایە یان کوڕی خوایە، پاشان لەگەڵ ئەمەشدا باوەڕیان وەهایە کە عیسا (عليه السلام) لەخاچ دراوەو کوژراوە.

**ئێمە لەم کاتەدا ئەم باوەڕە بێتاوەڕۆکەی خۆیان دەکەینە بەڵگەیەکی زیندو لەسەر نەفامییانو پێیان دەڵێین:**

أ- باشە گەر عیسا خوایە جولەکەکان چۆن توانیان کەدەست گیری بکەنو لەخاچی بدەنو بیکوژن؟! ئایا عیسا وەك خوایەك نەیتوانی بەهێزوو دەستەلاتی پەروەردگارێتی خۆی؟! غەزەب لەبکوژانی بگرێتو خۆی لەدەستی تاوانیان ڕزگاربکات؟! کەواتە گەر خوایەك ئەوەندە بێدەستەلات بێت ئەوە دەبێت بەچ شێوەیەك مافی خوایەتی پێ ببەخشرێو بەخوا ناوببرێ؟!

ب - لەخاڵی دووەمدا دەڵێین گەر عیسا کوڕی خوایە. کەهەروەك گاورەکان باوەڕیان وەهایە. ئەوە لەکاتی کوشتن‌و لەخاچ دانیدا خوای باوکی!! بۆ بەرگری لێنەکردوو سەلامەتی نەکرد لەدەستی بکوژانی!!؟

تۆ بڵێی خوای گەورە ئەوەندە بێدەستەڵات بێت لەبەرامبەر بەپیلانی بەندەکانیدا کەبۆ کوڕەکەی دای‌دەڕێژن!!؟

پاك‌و بێگەردی‌و بێهاوەڵی بۆ خوای گەورە لەقسەو بیروباوەڕو گومانی خراپی بەندە سەرکەش‌و نەفامەکان، کەبەهۆی بێباوەڕی‌و شوێن کەوتنی شەیتانەوە بیروباوەڕی ڕاست‌و دروستی خۆیان لەدەست دەدەن‌و ڕێگەی ((کفرو شرك‌و جهل وفسق و خراپەکاری‌و داوێن پیسی هەڵدەبژێرن)).

٥- گاورە خاچ پەرستەکان ئینکارن چونکە عیسا (عليه السلام) بەزمانی ڕاست‌و شیرینی خۆی دەفەرمێت ئەی گەلی بەنی ئیسرائیل من خوانیم، من کوڕی خوانیم بەڵکو من بەندەی خوای گەورەم‌و فەرمانم پێکراوە کڕنوش بۆ پەروەردگارم بەرم‌و هەمان فەرمانیش بەئێوە بکەم.

بەڵام لەگەڵ ئەم ڕاستیانەشدا گاورە خاچ پەرستەکان ئینکاری لەم ڕاستیە واقعیەدا دەکەن‌و بەرپەرچی توندی (عیسا)ی پێغەمبەریان دەدەنەوەو قسەی خۆیان زاڵ‌و سەردەخەن بەسەر قسەی خوای گەورەو پاشان عیسای کوڕی مەریەمدا.

خوای گەورەش دەربارەی سیفەتی ئینکاری لەمرۆڤەکاندا دەفەرمێت:

﴿ القيا في جهنم كل كفار عنيد ﴾

واتە: هەڵیبدەنە ناو دۆزەخەوە هەموو ئەو کەسانەی کەسیفەتی بێباوەڕی‌و ئینکاریان تێدابووە، خۆ ئەگەر سەیری ژیان‌و واقع‌و بیروباوەڕی گاورە خاچ پەرستەکان بکەین ئەوە زۆر بەئاشکرا ئینکاری ئەم ڕاستیانە دەکەن.

أ) ئینکاری پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ)لەسەر زمانی (عیسا)وە پێمان دەفەرمێت:

﴿ واذ قال عيسى يابني اسرائيل اني رسول الله اليكم مصدقا لما بين يدي من التوراة ومبشرا برسول يأتي من بعدي اسمه أحمد ﴾ (الصف: ٦)

واتە: عیسای کوڕی مەریەم ووتی: ئەی گەلی بەنی ئیسرائیل من پێغەمبەرێکی نێردراوی خوای گەورەم بۆلای ئێوەو بەڕاست ڕەوو ڕاست گۆم بۆ تەورات‌و پاشان مژدەتان پێدەدەم بەپێغەمبەرێك کەلەدوای من دێت بەناوی (احمد).

ب) ئینکاری کردنی قورئان‌و باوەڕنەکردن بەیاساو دەستورەکانی، ((عەقیدەتی، شەریعەتی، احکام ی....)).

پاشان باوەڕکردن بەو ئینجیلانەی کەدەست نوسی قەشەو پیاوانی کەنیسەکانن‌و دوورن لەقسەی خوای گەورەوە.

ج) باوەڕکردن بەوەی کەعیسا کوژراوەو لەخاچ دراوە لەگەڵ ئەمەشدا ئینکاری‌کردنی بەرزبوونەوەی عیسا بۆ ئاسمان هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿ وما قتلوه وماصلبوه ولكن شبه لهم..... بل رفعه الله اليه ﴾ (النساء: ١٥٧-١٥٨)

واتە: عیسا نەکوژراوەو نەلەخاچ دراوە بەڵکو وێنەی (عیسا)یان نیشان درا نەك عیسا خۆی... پاشان خوای گەورە بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان.

٦- گاورە خاچ پەرستەکان ستەم کارن (ظالم) چونکە هاوەڵ بۆ خوای گەورە بڕیاردەدەن‌و پاشان بڕیاردانی هاوەڵ بۆ خوای گەورە یەکێکە لەهەرە ستەمە گەورەکان هەروەك قورئان لەسەر زمانی لوقمانی حەکیمەوە بۆمان باس دەکات کەئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات‌و دەفەرمێت:

﴿ يابنى لاتشرك بالله ان الشرك لظلم عظيم ﴾

واتە: ئەی کوڕەکەی خۆم هاوەڵ بڕیار نەدەیت بۆ خوای گەورە چونکە هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوای گەورە ستەمێکی زۆر گەورەیە.

بەڵێ ئەم ستەمە گەورەیە لەناو گاورەکاندا بەئاشکرا بەدی دەکرێت چونکە گاورەکان باوەڕیان وەهایە کەلەغەیری خوای گەورە دوو خوای تریش هەن کەبریتین لە(عیسا)و(مەریەمی) دایکی. (سبحانه وتعالى عما يشركون).

## چەند پەند و ئامۆژگاریەکی زۆر گرنگ لە ڕوداووبەسەرهاتەکانی بەندی سێهەم

١- هەروەك لەسەرەتای بەندی سێهەم دا باسمان کرد کەوا جولەکەکان پیلانیان داڕشت‌و هەوڵیان دا بۆ کوشتنی عیسا(عليه السلام).

بەڵێ گەورەترین پەندو ئامۆژگاری لەم ڕووداوەدا بریتیە لەوەی کەسیلەت‌و سروشتی پیس‌و شەڕانگێزی جولەکەمان بۆ دەردەکەوێت کەبەدرێژای مێژوو چەندە خراپەکارو پێغەمبەر کوژ بوون.

هەڵدانەوە لاپەڕە ڕەشەکان لەسەر ژیان و مێژووی پڕلە تاوان و خراپەکاری جولەکەکان ئەو ڕاستیەمان تێدەگەیەنێت کەجولەکەکان هەرگیز خولازیار و عەوداڵی حەق نەبوون و بەردەوام لەهەوڵی دژایەتیکردنیدا بوون چونکە پێغەمبەران خاوەنی حەق بوون و هەموو کات لەدیاریکردن و دەست نیشان کردنی لایەنە خراپ و دزێوەکانی ناو کۆمەڵگادا بوون بۆ مەبەستی چارسەرکردن و ڕاست کردنەوە .

جولەکەش هەروەك باسمان کرد پیاو کوژی و بەدڕەفتاری و دژوەستان لەبەرامبەر حەق و پارەخۆری و کاسە لێسی و کاری سوکاری و مل نەدان بۆ فەرمانی خواو دەیان و سەدان سیفەتی تری لەم جۆرە کاری گەورەو سەرەکیان بووە لەیەکەم ڕۆژی دامەزراندیان و پاشان لەسەردەمی هەموو پێغەمبەرانی دوای موسا(عليه السلام)و تا ڕۆژی دوایش.

بەڵێ پێغەمبەرانی خاوەن پەیامی ئاسمانی و جولەکەی خاوەن پەیامی شەیتانی و دۆزەخی بەئاسانی لەیەك جێگەو شوێندا جێگایان نابێتەوەو هەردەبێت ڕۆژێك لەڕۆژان ئەم دوولایەنە بدەن بەیەکداو هەوڵی خۆسەرخستن بدەن بەسەر لایەنی بەرامبەردا.

هەر لەم ڕوانگەیەوە جولەکەکان ئەم هەوڵەیاندلو بەعەمەلیش جێبەجێیان کرد بەسەر لایەنی بەرامبەردا کە(عیسا) بوو (عليه السلام) بەڵام خوای گەورە سنورێکی دیاریکراوی بۆ دەستەڵاتی خیانەت کاری جولەکەکان داناو پیلانەکەیان ئەوەندە کاری گەری هەبوو کەکەسێکی غەیری عیسا (عليه السلام)یان کوشت و پاشان لەخاچیان دا.

٢- خوا ی گەورە کاتێ باسی ئینجیل دەکات پێنج سیفەتی سەرەکی تێدا کۆدەکاتەوە کەئەوەی زۆر مەبەست بێت باسی لێوە بکەین بریتین لە:

أ ) ﴿الهدى﴾ واتە: ڕێنیشان دان و ڕێنموێی کردن.

گومانی تێ دانیە کەوا سەرجەم کتێبە ئاسمانیەکانی خوای گەورە بۆ ئەو مەبەستە هاتون کەخەڵکی لەزەلکاوی نەفامی و تاریکی نەفامیەوە ڕابکوێزن بەرەو ڕووناکی و ڕێگەی ڕاست و دوور لەهەموو چەوتیەك.

کەواتە بەپێی ئەم یاسایەی سەرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەبڵێین: هەرکەسێك لابدات لەدینی خوای گەورەو هەڵبسێت بەهەڵبژاردنی هەر ڕێبازو ڕێچکەیەکی تری دنیایی ئەوە بەدڵنیاییەوە لەتاریکیدا دەژی و ڕێگەی هیدایەتی لێ ون بووە.

ب ) ﴿النور﴾ واتە: ڕووناکی.

هەروەك چۆن سەرجەم دینەکانی خوای گەورە سیفەتی هیدایەت دانی خەڵکیان هەبووە، ئاواو بەهەمان شێوەش سیفەتی ڕووناکی و ڕێڕۆشن کەرەوەیان هەبووە بەبێ جیاوازی.

بۆ نمونە خوای گەورە لەدەربارەی قورئانەوە دەفەرمێت:

﴿ كتاب أنزلناء اليك لتخرج الناس من الظلمات الى النور ﴾ (ابراهيم:١)

واتە: ئەی محمـد ئەم کتێبەمان بۆ ناردوویتە خوارەوە بۆ ئەو مەبەستەی کەخەڵکی لەتاریکیەکانەوە بەرەو ڕووناکی ڕاگوێزبکەیت.

هەروەها لەدەربارەی ئینجیلەوە دەفەرمێت:

﴿ واتيناه الانجيل فيه هدى ونور ﴾ (المائدة:٤٦)

واتە: ئینجیلمان پێبەخشی . واتە بەعیسا . کەتێیدا بوو ڕێنموێی‌و ڕووناکی.

وە بـۆ سـەرجەم دیـن‌و کتێبـە ئاسمانـەکانی تریـش بەهـەمان شـێوە بـوو چونکـە بەڕاستی گـەر کەسێك لـەدینی خـوای گـەورە دووربێـت ئـەوە مانـای ئەوەیـە لـەڕووناکی دوورەو سەرجەم کاتـەکانی ژیانی لـەتاریکیدا بەسـەر دەبات، خـوای گـەورەش بەسـۆزو خۆشەویسـتی خـۆی لەبەرامبـەر بەبـەندە تـاوان بـارو چەواشـەکراوەکانی خۆیـدا جارلـەدواجار دینـی خـۆی وەك نورێـك دەنـاردە خـوارەوە بـۆ ڕووناك کردنـەوەی دڵـە تاریکەکان‌و پاشان ڕۆشن کردنەوەی ڕێگەکانی شەیتان‌و هاوشێوەکانیان.

لەم کاتەدا خۆ دەبێت هەندێ کەسی بەرژەوەندی پەرست هـەروەك شەمشـەمەکوێرە ئاسا کەبەردەوام خوازی ئەوەن خۆشیان‌و خەڵکی لەتاریکیدا بژین هـەر بۆ ئـەم مەبەستە دژایەتی ئەو ڕووناکیانەیان کردووەو بەپێی توانا خەڵکیان لێدوورخستۆتەوە بەڵام:

﴿يريدون ليطفؤوا نور الله بأفواههم والله متم نوره ولو كره الكافرون﴾

٢- خوای گەورە لەکۆتای وەسفی ئینجیلدا دەفەرمێت ﴿موعظة للمتقين﴾

ئیمامی (فخرالدین ی ڕازی) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمێت:

(وانما خصها بالمتقين لانهم هم الذين ينتفعون بها)[٨]

واتە: لەبەر ئەو هۆکارە ئـەم سیفەتە پەیوەست کراوە بە(متقین)ە وە چونکە تەنها ئەمان سودی تەواوی لێوەردەگرن.

تـەقوا یەکێکـە لـەو کێڵگـە گـەورەو کاریگەرانـەی کـەپڵنگ ئاسـا هـێرش دەبـات بـۆ دەرگـای دڵـە داخراوەکان‌و سـەرجەم ئـەو کۆت‌و زنجیرە شـەیتانیانە دەپچڕێنـێ کـەپیایدا هەڵواسراوەو ڕووناکی دینی خوای گەورەی پێشاد دەکات.

---

(٨) التفسير الكبير (فخرالدين الرازى) ج/١٢/ ص: ٩).

بەڵێ بەرێزان تەنها ئەو کەسانە دەتوانن‌و توانای ئەوەیان هەیە کەسودو پەندو ئامۆژگاری لەدینی خوای گەورەو وەسیەت‌و فەرمانەکانی پەروەردگاریان وەربگرن کەخاوەنی تەقوان‌و بەڕاستی خۆیان دەپارێزن لەتاوان کردن‌و بەردەوام هەست بەچاودێری خوای خۆیان دەکەن.

تەقواش لەناو دڵدایەو بەترسان لەخوای گەورەو تاوان نەکردن‌و خۆپاراستن لەحەرام‌و هەوڵ دان بۆ بەدەست خستنی حەلاڵ‌و تێکۆشان لەرێی بانگەوازی بۆ ڕێگەی یەك خواناسی‌و گەیاندنی ئامۆژگاریەکانی خوای گەورە بەکۆمەڵگا .... دروست دەبێت.

گومانی‌شی تێدانیە کاتێ تەقواو لەخواترسان لەناو دڵی مرۆڤەکاندا دروست بوو ئەوە دڵەکان لەحاڵەتی ڕەشیەوە بەرەو سپی بوونەوە دەڕۆن‌و لە حاڵەتی ڕەق بوونەوە نەرم دەبنەوەو زۆر بەئاسانی ئەو دڵە دەبێتە شوێنگای خواپەرستی‌و وەرگرتنی ئامۆژگاریەکانی خوای گەورە.

وەبەپێچەوانەشەوە هەرکاتێ مرۆڤەکان دەستیان دایە پەرستنی دنیاو کۆکردنەوەی زۆرترین سەرمایەی پارەو ماڵی حەرام‌و پشتیان کردە دینی خوای گەورە.. ئەوە دڵەکانیان ڕەق دەبێت‌و پاشان ڕەش هەڵدەگەرێ‌و لەم کاتەدا گەر خوای گەورە بەتایبەتی لەئاسمانەوە نیگای بۆ بنێرێتە خوارەوە ئەوە دڵی نەرم نابێت‌و سوردەبێت لەسەر تاوان‌و بێباوەری خۆی‌و خوای گەورەش خەتمی ڕەشی خۆی دەدات لەسەر ئەودڵە بەبەردبووەو دەفەرمێت:

﴿ ختم الله على قلوبهم ﴾.

واتە: خوای گەورە خەتمی خۆی دەدات لەسەر دڵیان.

٣- دووبارەکردنەوەو زۆر پرسینەوە دەربارەی باسێك یان ڕووداوێك مانای گەورەیی‌و گرنگی ئەو باس‌و ڕووداوە دەسەلمێنێ!!

گەر هەر لەم ڕوانگەیەوە سەرنجی ئایەتەکانی قورئان بدەین زۆرێك لەم بابەتانەمان بەرچاو دەکەوێت.

بەڵێ یەکێ لەو بابەتانە بریتیە لەو قسەو گفتووگۆیەی نێوان خوای گەورەو عیسا (عليه السلام) لەڕۆژی دوایدا، ئەویش بەوەی کەخوای گەورە وەك دەربڕینی شێوە پرسیارێك لەعیسا دەفەرمێت:

﴿ ياعيسىٰ ءأنت قلت للناس اتخذوني وأمي الهين من دون الله ﴾؟

واتە: ئەی عیسا ئایا تۆ وتوتە بەخەڵکی کەوامن و دایکم بەدوو خوا بزانن لەبری خوای گەورە؟!))

بەڕاستی ئەم جۆرە گفتوگۆو ڕووداوانە ناخ و دڵی و هەست و نەستی مرۆڤەکان دەهەژێنێ و دەیان خاتە لەرزە چونکە لەڕۆژی دوایدا خەڵکی هەموو بەیەك جارو لەیەك ساتداو بەیەك شێوە حسابیان لەگەڵدا ناکرێت بەڵکو هەر ئومەتەی لەگەڵ ئەو پێغەمبەرەدا حسابیان لەگەڵدا دەکرێت کەوەك ئاگادارکەرەوەیەك لەدنیادا چوە بۆ لایان.

بەڵێ لەڕۆژی دوایدا خوای گەورە عیساو گەلەکەی جیادەکاتەوە لەو خەڵکەو بەتەنها محاسەبەیان دەکات و سەرەتا لەعیسا دەپرسێت و محاسەبەی ئەو دەکات چونکە وەڵامەکانی عیسا (عليه السلام) لەبەرامبەر پرسیارەکانی خوای گەورەدا دەبێتە بەڵگەیەکی زۆر زیندوو بەرچاو لەبەردەم گەلەکەیداو لەهەموو ڕویەکەوە قسەیان دەبڕێت.

هەر لەبەر ئەم خاڵەیە کەوا خوای گەورە بۆ زیاتر دەرخستنی بێهاوەڵی و یەکتای خۆی و بەندایەتی دروست کراوەکانی پرسیار ئاراستەی عیسا دەکات و پاشان وەڵامەکەی لەلایەن عیساوە دەدرێتەوە نەك بۆ ئەو مەبەستەی کەخوای گەورە ئاگاداربکرێت لەو مەسەلەیە بەڵکو بۆئەوەی کەئەو کەسانەی بەنەفامی و نەزانی خۆیان وادەزانن کە(عیسا)و (مەریەم)ی دایکی دووخوان و هیچ خوایەکی تر نیە.

**کەواتە دەتوانین لەم گفتوگۆوکردنەی نێوان خوای گەورەو عیسای کوڕی مەریەم (عليه السلام) چەند حکمەت و پەندو ئامۆژگاریەک وەربگرین کەئەمانەن:**

أ - دەرخستن و سەلماندنی یەکتای و پاك و بێگەردی و بێهاوەڵی خوای گەورە.

ب - بەهەمان شێوە سەلماندنی بەندایەتی و بێدەسەڵاتی سەرجەم دروست کراوەکانی خوای گەورە.

ج - هەڵوەشاندنەوەو بێڕێز سەیرکردنی عەقیدەو بیروباوەڕی ئەو کەسانەی کەباوەڕیان وەهابووە کە(عیسا)و (مەریەم)ی دایکی دوو خوان لەبونەوەردا.

د - قرتاندن و بڕینی بەڵگەو بیانووی ئەو کەسانەی کە(عیسا)و(مەریەمیان) بەدوو خوا زانیوە ئەویش بەشاهیدی دانی (عیسا) لەسەر ئەو ڕاستیەی کەفەرمانی پێنەکردوون بەوەی کەخۆی و دایکی بەدوو خوا بزانن!!

٤- دوا پەندو ئامۆژگاریمان لەبەندی سێهەم تەنها پەیوەستە بەو کەسانەی کەباوەڕیان وەهایە (عیسی)و(مەریەم)ی دایکی دوو خوان لەم بونەوەرەداو پێیان دەڵێین:

(ئەی ئەو کەسانەی کەباوەڕتان وەهایە!! تالەدنیادا ماون و نەمردوون و بەرەو قیامەت و لای پەروەردگارتان نەگەڕاونەتەوە بەخۆتاندا بێنەوەو لەپەروەردگارتان بترسن و ڕێگەی ڕاستی بگرن و دەست بەردلری ئەو ڕێگە چەوتەبن کەئێستە لەسەری دەڕۆن.

تازووەو لەدنیادان بگەڕێنەوە بۆلای خوای گەورەو تەوبەیەکی ڕاستەقینە بکەن و دروشمی یەکتاپەرستی . التوحید . بەرزبکەنەوەو (الله) بەخوای ئەم بونەوەرە بزانن و (عیسا)و(مەریەم)ی دایکیشی بەدوو بەندەی دروست کراوی خوای گەورە.

پەروەردگارتان زۆر لێبووردەیەو لەسەرجەم تاوانەکانتان دەبووری بەلام بەمەرجێ لەمە زیاتر هاوەڵی بۆ پەیدانەکەن و ڕۆنەچن لەم تاوان و ستەمە گەورەیەدا.

وەدڵنیاشتان دەکەین گەر ئێوە لەسەرئەم بیروباوەڕە بێناوەڕۆکەی خۆتان بەردەوام بن ئەوە تەنها خۆتان خەسارەت مەندی قیامەت دەبن و تاوانی هەموو ئەو کەسانەش هەڵدەگرن کەبەهۆی ئێوەوە دەبنە هەڵگری ئەو بیروباوەڕە خراپ و بێناوەڕۆکەی کە(عیسا)و(مەریە) بەدوو خوا بزانن، پاشان گەر ئێوە خۆتان بەشوێن کەوتەو دڵسۆزی (عیسا) دەزانن ئەوە. (عیسا) (عليه السلام) لەڕۆژی دوایدا خۆیتان لێبەری دەکات و شاهیدی دەدات لەسەر نەفامی ئێوەو پاشان بەندایەتی و بێدەسەلاتی خۆی.

# بەندی چوارەم

**خۆشەویستان بەندی چوارەم تەنها پەیوەست نیە بەتەنها بابەتێکی سەربەخۆوە بەڵکو چەند باسێکی جۆراوجۆری لەخۆگرتووە کەسەرەکیترینیان بریتیە لەهاتنە خوارەوەو گەڕانەوەی (عیسای کوڕی مەریەم) (عليه السلام) لەڕۆژی دواییدا بۆ سەر زەوی.**

بەڵێ یەکێ لەنیشانە گەورەکانی هاتن و نزیک بوونەوەی ڕۆژی دوای بریتیە لەدابەزینی عیسای کوڕی مەریەم لەئاسمانەوە بۆ سەر زەوی بۆ چەند مەبەستێکی گەورە کە لەباسەکانی داهاتودا ئاماژەیان بۆ دەکەین.

بێگومان. بەندی چوارەم — دوا بەندی ڕوداوەکانی ژیان و بەسەرهاتی عیسایە (عليه السلام)، وەزۆر بەپێویستمان زانی کەوا ئەم. بەندە. تایبەت بکەین بەم باسەوە تاچی تر خوێنەری بەڕێز ئاگاداری لەسەرجەم ژیانی ئەم پێغەمبەرە بەرزو ماندونەناسەدا هەبێت و شارەزای تەواوی لەڕووداوو بەسەرهات و ساتەکانی ژیانی پڕ مانوێتی (عیسای کوڕی مەریەم)دا بۆ دروست ببێت و هەوڵی ئەوەش بدات کەبەپێی توانا و بوار بۆ ڕەخسان پەخشی بکات بەناو خەڵکیدا تائەوانیش بەهەمان شێوەی ئەم شارەزای و زانیاری بۆ دروست ببێت و لەڕاستی مەسەلەکان بەتەواوی تێبگەن.

## باسی یەکەم:

گومان لەوەدانیە کەهاتنی ڕۆژی دوای یەکێکە لەو فەرمانە بڕیار لەسەر دراوانەی کەخوای گەورە بڕیاری لەسەر داوەو هەردەبێت ڕوبدات، لەگەڵ ئەمەشدا کاتی بۆ دیاری کردووە بەڵام مرۆڤەکانی لەوکاتە دیاری کراوو بڕیار لەسەردراوە ئاگادار نەکردۆتەوە ئەویش لەبەر چەندین حکمەتی گەورەیە کەلێرەدا بواری باس کردنیان نیە.

بەڵێ هەروەك باسمان کرد کەوا دەبێت ڕۆژێك بێت دنیا کۆتای پێبێت و یاسا گەردوونیەکان تێك بچن و ژیان لەسەر دنیادا بڕوات و قۆناغێکی نوێی مرۆڤەکان لەپاش مردن دەست پێبکات.

بەڵام ئەوەندە هەیە کە خابووربوون و تەواوبوونی ژیانی دنیا هەروا بەخێرای و لەشەوو ڕۆژێکدا ڕوونادات، بەڵکو ماوەیەکی پێدەچێت و لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر (ﷺ)

وەك ئاماژە پێکردنێك ئاماژەی بۆ هەندێ لەنیشانەی ئەو ڕۆژە کردووە، کەزانایانی ئیسلام. ڕەحمەتی خوایان لێبێت. نیشانەکانی هاتن و نزیك بوونەوەی ڕۆژی دوایيان دابەش کردووە بەسەر سێ قۆناغدا کەقۆناغێکیان ڕووی‌داوەو ڕۆیشتووە هەروەك (هاتنی پێغەمبەرو مردنی پێغەمبەرو کوشتنی عوسمانی کوڕی عەففان)و دەیان ڕوداوی‌تر کەئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کەبەشێکی لەنیشانەکانی نزیك بوونەوەی ڕۆژی دوایی نزیك بووەتەوە.

قۆناغێکی تری نیشانەکانی هاتن و نزیك بوونەوەی ڕۆژی دوای ئەوەیە کەئێستا (حاضر) بەبەردەوامی لەڕوداندایە هەروەك (نەمانی ئەمانەت، زۆربوونی کوشتن، ئارەق خۆری، داوێن پیسی، نەمانی زانستی شەرعی...).

قۆناغی سێ‌هەمی هاتن و نزیك بوونەوەی ڕۆژی دوای ئێستا لەم کاتەدا ڕووی نەداوە کەئەمیش چەند نیشانەو دیاردەی تایبەتی و سەربەخۆی خۆی هەیە.

یەکێ لەو نیشانەو دیاردانە بریتیە لەدابەزینی عیسا لەئاسمانەوە بۆ سەر زەوی.

بەڵێ پاش ئەوەی (دەجال) پەیدادەبێت لەسەر زەویداو بەدکاری و بێ‌باوەڕی بەرپادەکات خوای گەورە (عیسای کوڕی مەریەم) (عليه السلام) دەنێرێتە خوارەوە بۆ چەندین مەبەست کەیەکێ لەوانە لەناوبردن و کوشتنی دەجالەو ڕزگارکردنی خەڵکیە لەو ناڕەحەتی و ناخۆشیەیە کەبەدەست (دەجال) بێ‌باوەڕەوە توشیان هاتووە.

## باسی دووەم:

سەرنج دانی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) شاهیدی تەواو دەدەن لەسەر ئەو ڕاستیە کەگومان لەوەدا نامێنێت عیسا (عليه السلام) لەڕۆژی دوایدا دێتە خوارەوە بۆ سەر زەوی، خوای گەورە دەربارەی ئەم باسە دەفەرمێت:

﴿ وانه لعلم للساعة فلا تمترن بها...﴾ (الزخرف: ٦١)

واتە: (عیسا) (عليه السلام) دەبێتە هۆکاری ئەوەی کەخەڵکی زیاتر زانستیان هەبێت لەدەربارەی هاتنی ڕۆژی دوایی.

ئەویش بەوشێوەی کەکاتێ عیسا(عليه السلام) لەئاسمانەوە دێتەوە خوارەوە خەڵکی دڵنیادەبن لەوەی کەئەم ڕوداوە یەکێکە لەنیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی.

(ابن عباس وقتادة ومجاهدو سدی وضحاك) (ڕەحمەتی وایان لێبێت) لەتەفسیری (وانه لعلم للساعه)دا دەفەرموون: (انه خروج عیسی (عليه السلام) وذالك من اعلام الساعة لان

الله ینزله من السماء.......)[٩]

واتە: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەرئەوەی کەعیسا (عليه السلام) دێتو پاشان ئەم ڕووداوە لەنیشانەکانی هاتنی قیامەتە، چونکە خوای گەورە (عیسا) دادەبەزێنێ لەئاسمانەوە.......).

پاشان (ابن کثیر) لەتەفسیری هەمان ئایەتدا دەفەرمێت:

(هو خروج عیسا بن مریم (عليه السلام) قبل یوم القیامة)[١٠]

واتە: بریتیە لەهاتنو دەرکەوتنی (عیسای کوڕی مەریەم) (عليه السلام) لەپێش هاتنی ڕۆژی قیامەتی گەورە، کەهەموو مرۆڤەکان تێیدا ڕادەگیرێنو بەرەو بەهەشت یان دۆزەخ دەبرێت.

بەڵێ بەڕێزان ئەم ئایەتە لەقورئاندا بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر ڕاستێتی هاتنەوە خوارەوەی عیسا (عليه السلام) بۆ سەر زەوی لەڕۆژی دوایدا.

پاشان بەنسبەت فەرموودەی پێغەمبەریشەوە (عليه السلام) لەدەربارەی هاتنەخوارەوەی عیسا لەڕۆژی دوایدا بۆ سەر زەوی ئەوە فەرموودە زۆر زۆرەو پلەی ئەو فەرموودانە لەوبارەوە گەیشتونەتە ئاستی (متواتر).

لەزانستی فەرموودەشدا (علم الحدیث) (متواتر) بەهێزترین پلەی (حدیث)ە و پاشان (متواتر) بەوە دەوترێت کەکۆمەڵێك زۆر لەهاوەڵان ئەو فەرموودەیان لەپێغەمبەرەوە گێڕابێتەوە.

(انشاالله) لەباسەکانی داهاتودا دەچینە خزمەت ئەو فەرموودانەی کەباس لەهاتنەخوارەوەی (عیسی) دەکەن.

## کاتو شوێنی هاتنە خوارەوەی (عیسا) (عليه السلام)

عیسای کوڕی مەریەم لەدیمەشقەوە کەپایتەختی سوریایە لەسەر باڵی دوومەلائکەت دێتە خوارەوە هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێت:

((اذا بعث الله المسیح ابن مریم فینزل عند المنارة البیضاء شرقی دمشق بین مهرودتین، واضعا کفیه علی اجنحة ملکین، اذا طاطأ راسه قطر، واذا رفعه تحدر منه جمان کاللؤلؤ، فلایحل لکافر یجد ریح نفسه الامات...)) (رواه مسلم).

---

(٩) الجامع لاحکام القران (لایمام القرطبی) ج(١٦)، (ص: ١٠٥).

(١٠) تفسیر القران العظیم (لابن کثیر) ج(٤)، (ص: ١٤٢).

واتە: کاتێ خوای گەورە عیسای کوڕی مەریەم دەنێرێ، دادەبەزێ لەلای منارەی سپی خۆرهەڵاتی دیمەشقەوە لەنێوان بەرگێك دایەو بەزەعفەران بۆیاخ کراوە، عیسا (عليه السلام) هەردوو لەپی دەستی لەسەر باڵی دوو مەلائیکەت داناوە، کاتێ سەری ڕادەوەشێ نێ شەونمی ئاوی لێدەتکێتە خوارەوە، وەکاتێ سەری بەرزدەکاتەوە( هەروەك لۆلۆ وەهایە).

وەهەر هەناسەیەك دەدات تاکوێ چاوبڕکات کافران و بێباوەڕان لەبەرامبەریدا خۆیان پێناگیرێ و دەست بەجێدەمرن.

پاشان کاتی هاتنەخوارەوەی عیسا (عليه السلام) بریتیە لەنوێژی بەیانی ئەویش لەکاتێکدا کەجەنگاوەرانی ئیسلام ڕیزیان بەستووە خەریکی جەماعەتن لەوکاتەدا عیسا(عليه السلام) دێتە خوارەوە پیاوێکی صالح خەریکی پێش نوێژی کردنە بۆ موسڵمانان!!

لەم کاتەداو کاتێ ئیمامەکە کەعیسای کوڕی مەریەم دەبینێ دەست بەجێ لەجێگای ئیمامەت لادەچێ و فەرموو لەعیسا پێغەمبەر دەکات (عليه السلام) بۆ مەبەستی پێش نوێژیکردن بۆ موسڵمانان، بەڵام عیسا (عليه السلام) دەست دەدات بەشانی ئەو ئیمامە بەرێزەداو پێی دەفەرێت قامەت بۆ تۆ کراوەو دەبێت تۆ پێش نوێژیەکە بکەیت هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێت:

((تقدم فصل، فانها لك أقيمت)) (صحيح الجامع الصغير/ج[٦]، (ص: ٢٧٧) واسناده صحيح.

لەم کاتەدا ئیمامەکە پێش نوێژیەکە بۆ جەنگاوەران دەکات و یەکێ لەجەنگاوەرانیشی بریتیە لەعیسای کوڕی مەریەم.

## سەرەکی‌ترین کاری عیسا (عليه السلام) لەدوای دابەزینی بۆ سەرزەوی

بێگومان هاتنەخوارەوەی عیسا (عليه السلام) بۆ سەر زەوی هەروا کارێکی هەوانتە نیەو بەڵکو دەیان کاری سەرەکی لەخۆحەشارداوە کەگرنگ ترینیان بریتین لەمانە:

**١- شکاندن و لەناوبردنی خاچ (صليب):**

یەکەمین کاری عیسا (عليه السلام) بریتیە لەشکاندنی ئەو خاچە (الصليب) درۆینەی گاورە خاچ پەرستەکان کردوویانە بەدروشمی دینی و عەقیدی خۆیان و باوەڕیان وەهایە کەعیسا (عليه السلام) لەلایەن جولەکەکانی سەردەمی خۆیەوە کوژراوەو پاشان لەخاچ دراوە، گومانی تێدانیە کەئەم بیروباوەڕە ڕاست نیەو دژی فەرمودەی خواو پێغەمبەرو واقعە.

عیسا (عليه السلام) بۆ مەبەستی سەلماندنی فەرموودەی پەروەردگاری و پاشان بەدرۆخستنەوەی بیروباوەڕی هەڵەی خاچ پەرستەکان دەست دەکات بەشکاندن و

لەناوبردنی ئەو خاچە (صلیب) سزێنەی کەهەزاران ساڵە خەڵکی دەیکەنە گەردنیان و بوەتە دروشمی کەنیسەو گاورەکان.

**٢- کوشتنی بەراز:**

یەکێکی تر لەکارە گرنگەکانی عیسا (عليه السلام) بریتیە لەکوشتن و لەناوبردنی بەراز ئەمیش بۆ مەبەستی نەهێشتنی ئەو حەرامەیە کەبەدرێژایی مێژوو مرۆڤەکان بەگشتی و گاورەکان بەتایبەتی بەخواردنی سەرەکی خۆیان زانیوە.

**٣- سڕینەوەی جزیەو وەرنەگرتنی:**

گومان لەوەدا نیە کەئەو جولەکەو گاورانەی لەوولاتی ئیسلامیدا دەژین و بەردەوامن لەسەر بیروباوەڕو دینی خۆیان ئەوە دەبێت (جزیە) بدەن و، واتە پارە بدەنە کاربەدەستی موسڵمانان، جالەپاش ئەم پارە دانە بەحوکمەتی ئیسلامی ئەوە ئازادن کەجولەکەبن یاگاور .

پاشان واجب دەبێت لەسەر کاربەدەستانی ئیسلامی کەسەرو ماڵ و کەسەیاتی و ژیانی ئەو جولەکەو گاورانە بپارێزن کەلەخاک و نیشتمانی موسڵماناندا دەژین.

بەڵێ ئابەو شێوەیە گاورو جولەکە لەوولاتانی ژێر دەستەڵاتی ئیسلامیدا جێگەیان دەبێتەوە بەومەرجەی کەپارەبدەن.

*بەلام لەکاتی دابەزینی عیسا (عليه السلام) بۆ سەر زەوی ئەم یاسایە نامێنێت، بەڵکو ئەو گاورو جولەکانەی کەلە وولاتانی ئیسلامیدا دەژین لەنێوان دوو چارەنوسدا سەرپشك دەکرێن:*

أ ) یان موسڵمان بوون و خۆ تەسلیم کردن بەدینی خوای گەورە ((بێگومان ئەم رێگەیە بەرژەوەندی دنیاو دوارۆژی تێدایە)).

ب ) یان کوشتن و لەناوبردنیان کە(ئیمامی نووی) لەم بارەوە دەفەرمێت:

((الصواب انه لايقبلها، ولايقبل من الكفار الا الاسلام، ومن بذل منهم الجزية لم يكف عنه، بل لايقبل الا الاسلام، أو القتل))(١١)

---

(١١) شرح النووى على مسلم/ ج٢، (ص: ١٩٠)، وكتاب (القيامة الصغرى وعلامات القيام الكبرى الد كتور . عمر سليمان الاشقر (ص/ ٢٦٧ . ٢٦٨).

واتە: ڕاست لەم یاسایەدا ئەوەیە کەعیسا (عليه السلام) جزیە قبوڵ ناکات، وەلەبێباوەڕان قبوڵ ناکرێت تەنها موسڵمان بوون زیاتر، وەهەر کەسێك جزیەی بەخشی ئەوە ڕزگاری نابێت بەڵکو دەبێت موسڵمان ببێت یان دەکوژرێت...)).

پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ئەم خاڵانەی سەرەوە کەباسمان کرد دەفەرمێت:

((والذی نفسی بیده لیوشکن ان ینزل فیکم ابن مریم حکما مقسطا فیکسر الصلیب، ویقتل الخنزیر، ویضع الجزیة، ویفیض المال حتی لایقبله احد، حتی تکون السجدة الواحدة خیرا من الدنیا ومافیها)) (رواه البخاری ومسلم وابوداود)).

واتە: سوێندبێت بەوکەسەی کەگیانی منی بەدەستە نزیکە عیسای کوڕی مەریەم بێتە خوارەوە بۆ ناوتان بەحەکەمێکی دادپەروەر، ئەوجا خاچ دەشکێنێ و بەراز دەکوژێ و جزیە هەڵدەگرێ و لایدەبات، پاشان سامان و دارای ئەوەندە زۆر دەبێت کەس نایەوێت تاوای لێدێت کەسوجدە بردنێك بۆ خوای گەورە چاکترو باشتر دەبێت بەلای مرۆڤەکانەوە لەدنیا سەرجەم ئەو شتانەی کەتێیدایە.

٤- کوشتنی دەجال:

یەکێکی تر لەکارە سەرکی و گرنگەکانی عیسا (عليه السلام) بریتیە لەکوشتنی دەجال. (علیه اللعنة).

بێگومان دەجال یەکێکە لەو کەسە بێباوەڕانەی کەبانگەشەی پەروەردگارێتی خۆی دەکات و دەڵێت من خوام (والعیاذ بالله).

دەجال دەیان و سەدان کاری سەرسوڕهێنەر لەبەرچاوی خەڵکی ئەنجام دەدات بۆ ئەو مەبەستەی کەخەڵکی پێچەواشە بکات و لەدینی ڕاست و دروستی خوای گەورە دووریان بخاتەوە.

دەجال بۆ ماوەی (٤٠) ڕۆژ لەسەر زەویدا دەمێنێتەوەو هەموو سەرزەوی دەگەرێت تەنها (مەکەو مەدینە) نەبێت.

فتنەی دەجال ئەوەندە خراپ و شەڕانگێزە دووچاری زۆربەی زۆری خەڵکی سەرزەوی دەبێت تەنها کەمێك لەباوەڕداران نەبێت کەباوەڕ بەدەجال ناکەن و شوێنی ناکەون و چەك دژی خۆی و شوێن کەوتوانی هەڵدەگرن.

لەم کاتەدا خوای گەورە عیسای کوڕی مەریەم (عليه السلام) لەڕۆژهەڵاتی دیمەشقەوە لەسەر باڵی دووفریشتە دەنێرێتە خوارێ بۆ ناو موسڵمانان دەست بەجێ دەجال بەرەو (بیت المقدس) لەفەلەستین دەکەوێتە ڕێ، عیساو موسڵمانان دەکەونە شوێنی هەتا عیسا

(عليه السلام) دەجال لەجێگایەك دەگرێ بەناوی (لد)ەوە كاتێ دەجال . عليه اللعنه . عیسا دەبینێ لەجێگاو شوێنی خۆیدا هەروەك خوێ دەتوێتەوەو پاشان عیسا (عليه السلام) بەو چەكەی بەدەستیەوەیەتی دەیكوژێ پاشان شوێن كەوتوەكانی كەدەبینن وادەجالی پێشەواو گەورەیان كوژراوە دەست بەجێ دەڕوخێنو هەرەس دەهێننو موسڵمانان شوێن یان دەكەون تاسەرزەوییان لێپاك دەكەنەوە خەڵكی ڕزگاردەكەن لەو فتنەو ناڕەحەتیەی كە دووچاریان بووە))[١٢]

لەم كاتەدا كاتێ خەڵكی دەبینن كەوا دەجال كوژراوەو لەناوبراوە دەگەنە ئەو باوەڕو یەقینەی كەدەجال خوانیە بەڵكو بەندەیەكی لاوازەو دەستەڵاتی هەموو شتێكی نیە، وەئەو بانگەشەیەی كەبۆ ماوەیەك خەڵكی پێچەواشە دەكرد بەوەی كەدەی ووت من (خوام) ئەوە تەنها قسەی سەرلێوان بووەو لەڕاستییەوە دووربووە.[١٣]

تێبینی: (لد) گوندێكە لە فەلەسطین نزیك لە(بیت المقدس).

**ئەو فەرمودانەی كەلەم بارەوە هاتوون ژمارەیان زۆرە كەبریتین لە:**

**أ - ((يخرج الدجال في أمتي... فيبعث الله عسى بن مريم كانه عروة بن مسعود، فيهلكه))** (رواه مسلم).

واتە: دەجال دێت بۆ ئومەتەكەم پاشان خوای گەورە عیسای كوڕی مەریەمی بۆ ڕەوانە دەكات كەلەعروەی كوڕی مەسعود دەچێت)و دەجال دەكوژێ.

**ب - ((يقتل ابن مريم الدجال بباب لد))** (رواه احمد وترمذي).

واتە: كوڕی مەریەم كە عیسایە دەجال دەكوژێ لەلای دەرگای (لد)ەوە

**ج - ((قال عيسى: افتح الباب، فيفتحون ووراءه الدجال، معه سبعون ألف يهودي كلهم زوسيف محلي وساج، فاءذا نظر اليه الدجال ذاب كما يذوب الملح في الماء وينطلق هاربا...، فيدركه عند باب (لد) الشرقي فيقتله، فيهزم الله اليهود...))** (رواه ابن ماجه وحاكم وصحيح الجامع الصغير) . ج٦، (ص: ٢٧٥).

واتە: عیسا بەكۆمەڵی موسڵمانان دەفەرموێت:ئەو دەرگایەم بۆ بكەنەوە، كاتێ دەیكەنەوە دەجالی لێیە كەلەگەڵیدا (٧٠) هەزار جولەكە هەیەو هەمووشیان بەقەڵغانو شمشێرەوە ڕاوەستان، كاتێ دەجال عیسا دەبینێ وەك خوێ لەئاودا چۆن دەتوێتەوە

---

(١٢) اشراط الساعة، يوسف بن عبدالله بن يوسف الوابل (ص:٢٣٣).

(١٣) القيامة الصغرى وعلامات القيامة الكبرى . دكتور عمر سليمان الاشقر (ص: ٢٦٤).

دەجالیش هەمان حاڵەتی بەسەردادێت و لەدەستی عیسی ڕادەکات تالەلای خۆرهەلاّتەوە دەیگرێت کەبەدەرگای (لد) بەناوبانگە، لەوکاتەدا عیسا دەجال دەکوژێ و پاشان خوای گەورە جولەکەکان ژێردەخات.

**٥- داواکردن لەخوای گەورە بەلەناوبردنی (یاجوج و ماجوج)؛**

یەکێکی تر لەکارە سەرەکی و گرنگەکانی عیسا(عليه السلام) لەپاش لەناوبردنی دەجال بریتیە لەداواکردن لەخوای گەورە بەلەناوبردنی (یەئجوج و مەئجوج)، (ئەئجوج و مەئجوج) کۆمەڵێکی خراپەکارو بەدڕەوشتن و سەرەکی ترین کاریان بریتیە لەکوشتن و بلاّوکردنەوەی فەسادو بێباوەڕی لەناو خەڵکیدا.

(یەئجوج و مەئجوج) لەزۆری ڕێژەی ژمارەیاندا ئەوەندە زۆرن کەهیچ کەسێك ناتوانێت بەرەنگاریان ببێتەوەو نژیان بووەستێ، هەربۆیە لەم کاتە عیسای کوڕی مەریەم (عليه السلام) دەست دەکات بەدووعاکردن لێیان لەلای خوای گەورە بەلەناوبردیان، خوای گەورەش داواکەی جێبەجێ دەکات و کرمێك لەقوڕگی (یەئجوج و مەئجوج)دا دروست دەکات و هەموویان بەیەك جار دەمرن.

پێغەمبەر (ﷺ) لەم بارەوە دەفەرمێت:

((ویخرجون علی الناس، فیسقون المیاه، ویفر الناس منهم، فیرمون سهامهم فی السماء، فترجع مخضبة بالدماء، فیقولون: قهرنا أهل الارض، وغلبنا من فی السماء قوة وعلوا... قال: فیبعث الله عزوجل علیهم نغفا فی أقفائهم فیهلکهم......)). (رواه الترمذي وقال حسن غريب).

واتە: یەئجوج و مەئجوج دێنە دەرەوە بۆ خەڵکی و پاشان کەدەگەن بەهەرئاوێك دەیخۆن و خەڵکی لەدەستیان ڕادەکات، لەم کاتەدا تیرەکانیان هەڵدەدەن بۆ ئاسمان، کەدێتەوە بۆ خوارەوە بەخوێنەوە دێتەوە خوارێ، پاشان دەڵێن: زاڵ بووین بەسەر خەڵکی سەر زەویداو سەرکەوتین بەسەر خەڵکی ئاسمانیشدا!! بەهۆی هێزو دەستەلاّتمانەوە، لەم کاتەدا خوای گەورە کرمێك لەقوڕگیاندا دروست دەکات و بەم شێوە دەمرن و لەناو دەچن...

بەڵێ پاش لەناوچوونی (یەئجوج و مەئجوج) زەوی پاك دەبێتەوە لەخراپەو تاوان و دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی ئاسایی جارانی خۆی و خوای گەورە بۆ جارێکی تر بەرەکەتی خۆی دەبەخشێتەوە بەسەر زەوی و ڕزق و ڕۆزی زیاددەکات و خەڵکی لە دڵ ئارامی و خۆشیەکی زۆردا دەژین.

زەویە مردوەکان سەوز دەبنەوەو گوانە وشکەوەبوەکان پڕ دەبنەوە لەشیرو دارەبێ بەروبوومەکان بەریان دێتەوە بەبەرداو لەهەموو لایەکەوە ڕەحمەتو بەرەکەتو ڕزقی خوای گەورە دێتەوە بۆ سەر زەوی.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێت:

((... ثم يقال الارض: انبتي ثمرتك، وردي بركتك، فيؤمئذ تاكل العصابة من الرمانة، ويستظلون بقحفها، ويبارك في ارسل حتى أن اللقحة من الابل لتكفي الفئام من الناس، واللقحة من البقر لتكفي القبيلة من الناس، واللقحة من الغنم لتكفي الفخد من الناس)) (رواه مسلم كتاب الفتن باب ذكر الدجال).

واتە: پاشان بەزەوی دەوترێت بچینە بەرهەمت، وەبلاوی بکەرەوە بەرەکەتت، ئالەو کاتەدا کۆمەڵێك لەخەڵکی تەنها هەنارێك بەشیان دەکات بۆ خواردنو پاشان بەتوێکڵی ئەو هەنارە سێبەرێك بۆ خۆیان دروست دەکەنو لەژێریدا دەحەوێنەوە پاشان بەرەکەت دەکەوێتەوە.

## بڵاوبونەوەی خێرو خۆشیو هەرزانی لەسەردەمی عیسادا (عليه السلام)

ئەو سەردەمەی عیسا (ﷺ) کەفەرمان ڕەوای تێدا دەکات سەردەمی هەرزانیو خۆشیو بەرەکەتی خواییە، سەردەمی نەمانی ستەمو بێباوەڕیە، سەردەمی لەناوچوونی نەفامیو قاتو قڕیو فەقیریە، سەردەمی بڵاوبوونەوەی ئاشتیو ئیمانو ڕۆزی خواییە.

سەردەمی نەمانی بەغیلیو حەسودیو ڕقوقینە لەدڵە بەبەردبووە ڕەش داگیرساوەکاندا....

سەردەمێکە کەبەڕاستی نیعمەتو بەرەکەتی خوای گەورەی تێدا دەبینریو ڕۆزی خوای گەورە بەجۆرێك زیاددەکان کەکۆمەڵێکی زۆر لەخەڵکی تەنها یەك هەنار بەشیان دەکاتو تێری لێدەخۆنو پاشان توێکڵی ئەو هەنارە دەکەن بە سێبەرێك بۆ خۆیانو ئیسراحەتی لەژێردا دەکەن!!

پاشان شیر لەگوانی مانگاو ئاژەڵە شیردارەکاندا ئەوەندە زۆر دەبێت کەبەجارێك یەك هۆزی زۆر لەو شیرە تێر دەخۆنو پێداویستیەکانیانی پێدابین دەکەن))

هۆکاری ئەم نعمەتو ڕزقو خۆشیەش دەگەڕێتەوە بۆ دادپەروەری حوکمی خوای گەورە کەعیسا (عليه السلام) وەك نێردراوێکی خوایی جێبەجێی دەکاتو ڕێگەنەدان بەهیچ کەسێك کەمافی خەڵکانیتر بخوات.

## ماوەی مانەوەی عیسا (عليه السلام) لەسەر زەویدا

ماوەی مانەوەی عیسا (عليه السلام) لەسەر زەویدا بریتیە لە(٧) ساڵ وەلەهەندێ فەرموودەیتردا بریتیە لە(٤٠) ساڵ.

پێغەمبەر (ﷺ) لەم بارەوە دەفەرمێت: ((فيبعث الله عيسى ابن مريم.... ثم يمكث الناس سبع سنين ليس بين اثنين عداوة، ثم يرسل الله ريحا باردا من قبل الشام، فلايبقى على وجه الارض احدا في قلبه مثقال ذرة من خير او ايمان إلا قبضة)) (رواه مسلم ، باب ذكر الدجال مع شرح النووي)

واتە: خوای گەورە عیسای کوڕی مەریەم دەنێرێ... پاشان بۆ ماوەی (٧) ساڵ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە، بەهیچ شێوەیەك لەنێوان دووکەسدا کرژیو ناخۆشی پەیدانابێت، پاشان خوای گەورە لەلای شامەوە ڕەشەبایەکی سارد دەهێنێ، بەهاتنی ئەو ڕەشەبایە تەنها کەسێ لەسەر زەویدا نامێنێ کەبچوکتر لەگەردیلەیەکیش باوەڕو چاکە لەدڵی دابێتو هەموو بەیەك جار دەمرن.

هەروەها لەفەرموودەیەکیتریشدا دەفەرمێت:

((فيمكث في الارض اربعين سنة، ثم يتوفى، ويصلي عليه المسلمون)) (مسند امام احمد، قال ابن حجر صحيح) .

### سەرنجێك !!:

گەر بەوردیکەش سەرنجێکی هەر دووفەرمودەکە بدەین دەبینین کەوا جیاوازی لەنێوان فەرموودەی یەکەمو فەرموودەی دووەمدا هەیە، ئەویش بەوەی کەلەفەرموودەی یەکەمدا ماوەی مانەوەی عیسای بە(٧) ساڵ دیاری کردووەو لەفەرموودەی دووەمیشدا بە(٤٠) ساڵ.

*زانایان لەدەربارەی ئەم دوو فەرموودەیەوە دەفەرموون:*

((تێگەیشتن لەناوەڕۆکی ئەم دوو فەرموودەیە ئەو جیاوازیە نامێڵێت چونکە عیسا (عليه السلام) کاتێ لەدنیادا بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان تەمەنی (٣٣) ساڵ بوو، وەکاتێ دێتەوە خوارەوە بۆ سەر زەوی (٧) ساڵ دەمێنێتەوە، کەواتە (٣٣ + ٧ = ٤٠) ساڵ، هەر لەبەرئەوەیە کەلەفەرموودەی دووەمیشدا ئاماژە بۆ سەرجەم ژیانی دەکات لەکاتی لەدایك بوونیەوە تاکاتی مردنی لەدوارۆژدا . وەخوای گەورەش زاناترو ئاگادارترە بەم ڕاستیە.

## ئایا عیسا (عليه السلام) بەچی حوکم دەکات لە پاش دابەزینی بۆ سەر زەوی؟

ڕێی تێدەچێ کەپرسیاربکرێت و بوترێت؟!

((ئایا عیسا (عليه السلام) کاتێ دێتەوە بۆ سەر زەوی بەچی حوکم دەکات؟! بەو (ئینجیل)ەی کەپێی بەخشرا؟! یان بەو قورئانەی کەپاش (ئینجیل) بۆ پێغەمبەرو ئومەتەکەی هات و سەرجەم یاساو دین و شەریعەتەکانی پێش خۆی سڕیەوە؟!

لەوەلأمدا دەڵێین:

عیسا (عليه السلام) بەقورئان و شەریعەتی ئیسلام کاردەکات و خۆی دەبێتە شوێن کەوتەیەکی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) پاشان عیسا (عليه السلام) کاتێ دێتەوە سەر زەوی بەشەریعەت و دین و بەرنامەیەکی نوێوە نایەتە خوارەوە بۆ ناو خەڵکی، چونکە دینی ئیسلام کۆتا پەیامی خوای گەورەیە بۆ مرۆڤەکان تا ڕۆژی دوای.

بەڵگەش لەسەر ئەم ڕاستیە ئەوەیە کاتێ لەئاسمانەوە دێتەوە بۆ سەر زەوی بانگ دەکرێت کەپێش نوێژی ـ واتە ـ ئیمامەت ـ بۆ موسڵمانان بکات!! بەڵام عیسا (عليه السلام) ئەم داخوازیە قبوڵ ناکات و لەدوای یەکێ لەئیمامەکانی ئومەتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) نوێژ دەکات.

پاشان بەهاتنی عیسا (عليه السلام) تەکلیفی شەرعی و فەرمانی خوای گەورە لەسەر موسڵمانان لاناچێت، چونکە عیسا (عليه السلام) بەهەمان شێوەی موسڵمانان نوێژ دەکات بەکۆمەڵ ـ جماعة ـ پاشان جیهاد دەکات و شان بەشانی موسڵمانان دەجال دەکوژێ.

## ڕەواندنەوەی گومانێک!!؟

زۆر کەسی چەواشەی و نەفام ڕەخنەی ساختەکارانە دەگرن و دەڵێن:

هاتنەوە خوارەوەی عیسای کوڕی مەریەم لەڕۆژی دوایدا ئەو فەرموودەی پێغەمبەر بەدرۆ دەخاتەوە کەخۆی دەفەرمێت: ((لانبی بعدی)) واتە: لەدوای من ـ واتە محمد ـ پێغەمبەر نایەت!!

ئیمامی نووی ـ ڕەحمەتی خوای لێبێت لەوەلأمی ئەم کەسە نەفامانەدا دەفەرمێت:

(هذا استدلال فاسد، لانه ليس المراد بنزول عيسى (عليه السلام) الذي ينزل بشرع ينسخ شرعنا، ولا في هذة الاحاديث، ولا في غيرها شيئ من هذا...... بل صح انه ينزل حكما مقسطا، يحكم شرعنا، ويحى من امور شرعنا ماهجرة الناس)[١٤]

---

(١٤) شرح النووی علی مسلم.

واتە: ئەم جۆرە پرسایرو قسەیە بەڵگەیەکی بێناوەڕۆك‌و فاسدە، چونکە مەبەست لەدابەزینی عیسا ئەوەنیە کەبەشەریعەتی تازەوە دابەزێ عیسا (عليه السلام) بەڵکو ڕاست ئەوەیە کەدابەزینی عیسا مەبەست پێی بریتیە لەفەرمان ڕەواییەك لەسەر بناغەی دادپەروەری‌و پاشان بەشەریعەتی ئێمە فەرمان دەکات‌و هەڵدەستێت بەزیندوکردنەوەی شەریعەتی ئێمە کەخەڵکی کۆچیان لێکردووەو پشت گوێیان خستووە.

## خۆش گوزەرانی خەڵکی لە پاش عیسا (عليه السلام)

خەڵکی لەپاش مردنی عیسا (عليه السلام) زۆر بەخۆشی ژیان بەسەردەبەن هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێت:

((طوبى لعيش بعد المسيح، يؤذن للسماء في القطر، ويؤذن للارض في النبات، حتى لو بذرت حبك على الصفا لنبت، وحتى يمر الرجل على الاسد فلايضره، ويطأ على الحي فلاتضره، ولاتشاح، ولاتحاسد، ولاتباغض))(١٥)

واتە: خۆشحاڵی‌و خۆش ژیان بۆ دوای عیسا (عليه السلام) ئەویش بەوەی کەئیزن بە ئاسمان دەدرێت کەبباری‌و پاشان ئیزنی زەوی دەدرێت کەبەرووبوومی لێبڕوێ، تاکاردەگاتە ئەو پلەیەی گەر تۆوێك لەسەرکێوی (صفا) بڕوێنی ئەوە دەڕوێت، پاشان ئاسایش بڵاودەبێتەوە بەشێوەیەك کەئەگەر پیاوێك بەلای شێرێکدا بڕوات ئەوە زیانی پێناگات، وەئەگەر بەلای مارێکدا بڕوات زیانی پێناگەیەنێت.

بەڵێ لەوکاتەدا نابینیت کەوا خەڵکی لەگەڵ یەکتردا دەمە قاڵە بکەن لەسەر شتی بێبایەخ‌و حەسودی بەیەکتری ببەن‌و ڕق‌وقین لەدڵیاندا هەبێت لەبەرامبەر یەکتردا.

## چەند خاڵ و ئامۆژگاریەکی گرنگ لەباسەکانی بەندی چوارەم

١- دابەزینی عیسا (عليه السلام) لەئاسمانەوە بۆ سەر زەوی ڕاستیەکی بەڵگە نەویستەو بەفەرمودەی خوای گەورەو پێغەمبەر سەلمێنراوە هەروەك لەدرێژەی باسەکاندا ئامارەی بۆکراوە.

*لەگەڵ ئەوەشدا ئەم مەسەلەیە پەیوەندیەکی زۆری هەیە بەدوو لایەنی سەرەکیەوە کەبریتین لە:*

---

(١٥) حديث صحيح رواه أبوبكر الانباري، والديلمي، سلسلة الاحاديث الصحيحة، ج٤ (ص: ٥٥٩)، ورقمه(١٩٢٦).

**أ** - لایەنی بیروباوەڕ (عقیدە) بەو شێوەیەی کەپێویستە لەسەر سەرجەم موسڵمانان کە باوەڕی تەواویان بەم مەسەلەیە هەبێت و دوو دڵی و گومانی‌یان بەهیچ شێوەیەك بۆ دروست نەبێت.

وەهەرکەسێ گومانی لەم مەسەلەیەدا هەبێت ئەوە بازوو بەبیروباوەڕی خۆیدا بچێتەوەو ئاگاداری خۆی بێت چونکە دابەزینی عیسا (عليه السلام) یەکێکە لەو مەسەلە گرنگ و ڕاستیە گەورانەی کەبواری دوودڵی و گومانی‌تێدا نەماوەتەوەو خوای گەورە بەفەرموودەی خۆی و پێغەمبەر (ﷺ) بەدەیان فەرموودەی جۆربەجۆرو پاشان سەرجەم لایەن و بوارەکانی ئەم مەسەلەیە کردووە.

پاشان هەرکەسێ باوەڕی بەم مەسەلەیە نەبێت ئەوە حوکمی ئیسلام لەبەرامبەر بەوکەسە بریتیە لەبێ‌باوەڕ دانانی چونکە ئەو کەسەی ئینکاری لەم ڕاستیە بکات ئەوە مانای ئەوەیە ئینکاری لەقورئان و دەیان فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەرو قسەی سەرجەم زانایانی بەرزی ئەم ئومەتە دەکات!!.

**ب** - لایەنی نادیار (الغیب) یەکێکی‌تر لەولایەنە گرنگانەی کەئەم ڕووداوو مەسەلەیە ئاماژەی بۆ دەکەن بریتیە لەلایەنی نادیار (الغیب)، پێویستە لەسەر موسڵمانان کەباوەڕیان بەسەرجەم ئەو لایەنە نادیارانە هەبێت کەلەقورئان و فەرموودە ی‌پێغەمبەردا (ﷺ) باسیان لێوەکراوە چونکە زۆرێك لەو مەسەلانەی کەباوەڕی موسڵمانی لەسەر دادەمەزرێت بریتیە لەبابەتە نادیارەکان وەك:

(باوەڕ بەخوای گەورە، بەڕۆژی دوای، بەقەزاو قەدەر، بەفریشتەکان، بەشادی و سزای ناو گۆڕ، بەبەهەشت و خۆشیەکانی، بەدۆزەخ و سزاکانی...).

بەڵێ ئەمانەو دەیان و سەدان بابەتی تری لەم جۆرە نادیارن و لەگەڵ ئەوەشدا داواکراوە لەموسڵمانان کەباوەڕیان پێ‌بهێنن و بچوکترین گومان و دوو دڵی یان لەبوون و حەقیقەتی ئەم جۆرە شتانەدا نەبێت.

وەگومانی‌شی تێدانیە کەیەکێ لەو مەسەلە نادیارانەی کەپێویستە باوەڕی تەواوی پێ‌بهێنین بریتیە لەباوەڕهێنان بەدابەزینی عیسا (عليه السلام) لەئاسمانەوە بۆ سەر زەوی.

﴿الم ذالك الكتاب لاريب فيه هدى للمتقين، الذين يؤمنون با لغيب......﴾ (البقرة: ٣-١)

٢- دابەزینی عیسا (عليه السلام) لەئاسمانەوە بۆ سەر زەوی ئەوە ناگەیەنێت کەپێغەمبەرێکی‌تر دێت لەدوای (محمد) (ﷺ) بەڵکو ئەم دابەزینە ئاماژە بۆ بەرزی و

گەورەی پێغەمبەری ئیسلام دەکات کەعیسا وەك نێردراوێکی خوایی دەبێتە یەکێ لەئومەتەکەو جێبەجێکەری شەریعەتەکەی.

٣- هاتنی عیساو دابەزینی لەئاسمان و نوێژکردنی لەدوای پیاو چاکێ لەئومەتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) گەورەترین ڕێزو پلەی پیاوچاکان و بۆخوا سوڵحاوانی ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەسەلمێنێ، کەهەروەك عیسا (عليه السلام) لەدەربارەی ئومەتی پێغەمبەرەوە دەفەرمێت:

((تکرمه الله هذه الامة)) (رواه مسلم)

واتە: خوای گەورە ڕێزی ناوە لەم ئومەتە.

٤- مانەوەی عیسا (عليه السلام) لەسەر زەوی مانای نەهێشتنی بێباوەڕی و ساختەکاری و درۆزنی و چەواشەکردنی خەڵکی و لەناوبردنی جولەکەو کۆتای هێنان بەسیستمی تاوان و دووڕوویی و دنیاپەستی و حەرام خۆری و بێفەرمانی خوای گەورە دەگەیەنێت.

((لەناوبردنی دەجال و دووعاکردن بە لەناوبردنی یەئجوج و مەئجوج و کوشتنی بەراز و بنەبڕکردنی جولەکە شاهیدی ئەم ڕاستیەن)).

*٥- دابەزینی عیسا (عليه السلام) چەندین ڕاستی و حکمەتی گەورەو گرنگی لەخۆدا حەشارداوە کەگرنگ ترینیان بریتین لەمانە:*

أ - بەدرۆخستنەوەی جولەکە، ئەویش بەوەی کەدەڵێن عیسای کوڕی مەریەممان کوشتووە. ((وقولهم انا قتلنا المسيح عيسى ابن مريم......))

خوای گەورە بەم دابەزینەی عیسا (عليه السلام) لەئاسمانەوە بۆ سەر زەوی سەرجەم جولەکەکان بەدرۆدەخاتەوە کەدەیان و سەدان هەزار ساڵە درۆدەکەن کەدەڵێن ئێمە عیسای کوڕی مەریەممان کوشتووە، پاشان خوای گەورە بەواقعی و عەمەلی ئەم بیروباوەڕە بێناوەڕۆکەیان هەڵدەوەشێنێ و عیسای کوڕی مەریەم یان نیشان دەدات و ئەوجا عیسا (عليه السلام) بەڕاستی هەڵدەستێت بەکوشتنی جولەکە.

ب - بەدرۆخستنەوەو هەڵوەشاندنەوەی بیروباوەڕی هەڵەو بێناوەڕۆکی گاورە خاچ پەرستەکان یەکێکی ترە لەحکمەتەکانی دابەزینی عیسا (عليه السلام) بۆسەر زەوی، چونکە گاورە خاچ پەرستەکان باوەڕیان وەهایە کە عیسا (عليه السلام) لەخاچ دراوە بەڵام دابەزینی عیسا (عليه السلام) لەدوا ڕۆژدا بەعەمەلی و واقعی دەبێتە هەڵوەشاندنەوەو بەدرۆخستنەوەی ئەم باوەڕە بێبنەمایە چونکە یەکێ لەکارە سەرەکی و گرنگەکانی عیسا (عليه السلام) بریتیە لەشکاندن و لەناوبردنی خاچ (صليب) کەگاورە خاچ پەرستەکان بەدروشمی سەرەکی خۆیانی دەزانن.

ج - یەکێکی‌تر لەحکمەتەکانی دابەزینی عیسا (عليه السلام) بریتیە لەسەلماندنی ئەو ڕاستیەی کەمەرجە ئەو کەسەی لەدنیادا لەدایك بێت ئەوە دەبێت هەر لەدنیاشدا بمرێت چونکە خوای گەورە دەفەرمێت:

﴿ منها خلقناكم وفيها نعيدكم ومنها نخرجكم تارة اخرى ﴾ (طه: ٥٥)

واتە: لەوخۆڵە دروستمان کردوون‌و پاشان دەتان گێڕینەوە ناوی. واتە. ناو ئەو خۆڵە کەبریتیە لەگۆڕ. پاشان بۆ جارێکی‌تر دەرتان دەهێنینەوە.

د - یەکێکی‌تر لەحکمەتەکانی دابەزینی عیسا (عليه السلام) بریتیە لەوەی کەسەرجەم جولەکەو گاورەکان. کەبە (اهل الكتاب) ناسراون باوەڕ بەپێغەمبەرایەتی عیسا دەکەن لەپێش مردنی. واتە مردنی عیسا. لەڕۆژی دوایدا، هەروەك قورئان دەفەرێت:

﴿ وان من اهل الكتاب الا ليؤمنن به قبل موته ﴾ (النساء: ١٥٩)

واتە: سەرجەم نامەدارەکان لە (گاورو جولەکە) باوەڕ بەعیسا (عليه السلام) دەهێنن پێش ئەوەی عیسا بمرێت.

چونکە بەچاوانی خۆیان دەبینن کەوا چۆن‌و بەچ شێوەیەك لەئاسمانەوە دێتە خوارەوەو پاشان دەجال دەکوژێ‌و فەرمان بەقورئان دەکات ئەوجا خاچ. صلیب. دەشکێنێ‌و لەناوی دەبات.

ئەو جۆرە باوەڕو ئیمانەی کەسەرجەم گاورو جولەکەکان بەبینینی عیسا دەی‌هێنن هیچ سودو بەرژەوەندیەکیان پێ‌ناگەیەنێت چونکە لەگەڵ ڕودان یان دەرکەوتنی یەکێ لەنیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوای باوەڕو ئیمان لەهیچ کەسێ قبوڵ ناکرێت گەر لەوەوپێش باوەڕی نەبوبێت.

خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرمێت:

﴿ يوم يأتي بعض آيات ربك لاينفع نفسا ايمانها لم تكن آمنت من قبل أو كسبت في ايمانها خيراً ﴾ (الانعام: ١٥٨)

واتە: ڕۆژێك دێت کەوا هەندێ لەنیشانەکانی پەروەردگارت دەردەکەوێ کەبێ‌گومان نیشانەکانی ڕۆژی دواییە. بەڵام ئەو باوەڕهێنانە هیچ سودێك ناگەیەنێت بەو کەسە گەر لەوەوپێش باوەڕی نەهێنابێت یان باوەڕی هێنابێت بەڵام کاری چاکەی ئەنجام نەدابێت.

٦- دەرکەوتن‌و دابەزینی عیسا یەکێکە لەنیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی کەخەڵکی بەبینینی ئەم ڕووداوە دەزانن کەڕۆژی دوای بەتەواوی نزیك بوەتەوەو بەڵگەیە لەسەر کۆتای ژیانی دنیاو ڕۆیشتن‌و کۆچ کردن بەرەو دنیایەکی‌تر، ئەویش ژیانی نەبڕاوەی قیامەتی گەورەیە کەخەڵکی بەرەو بەهەشت یان دۆزەخ ڕەوانە دەکرێن.

خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿ وانه لعلم للساعة ﴾ (الزخرف: ٦١)

واتە: دەرکەوتن و هاتنی عیسا دەبێتە هۆکاری ئەوەی کەخەڵکی زیاتر زانستیان هەبێت لەهاتنی ڕۆژی دوایی.

## دوا پەندو ئامۆژگاری لەسەرجەم ژیانی عیسا (عليه السلام)

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست وابەکۆمەکی پەروەردگار ئەوەی پێشکەش تان کرا لەژیانی پاک و بەرزو پڕ ئامۆژگاری عیسای کوڕی مەریەم (عليه السلام) کۆتای پێهات و تەنها باسێك نەما لەژیانی ئەو پێغەمبەرە ماندونەناسەدا کەفەرامۆشمان کردبێ و پشت گوێمان خستبێ و باسمان نەکردبێ هەر لەکاتی لەدایك بوونی تاکاتی مردن و پاشان دوای مردنیشی کەگفتوگۆکردنێتی لەگەڵ پەروەردگاریدا.

**خۆشەویستان ئەوەی لەسەرجەم ژیانی عیساوە (عليه السلام) فێریببین بریتیە لە:**

١- لەدایك بوونی عیسا (عليه السلام) بەبێ باوك و پاشان قسەکردنی بەدەستی دایکیەوە گەورەیی و بێسنوری دەستەلات و ویستی خوای گەورەمان نیشان دەدات لەگەڵ ڕاستێتی پێغەمبەرایەتی عیسا (عليه السلام).

٢- ناردنی عیسا (عليه السلام) بۆناو جولەکەکان بۆمەبەستی ئاگادارکردنەوەیان ڕەحمەتی خوای گەورەمان بۆ دەردەخات لەبەرامبەر بەندە تاوانبارەکانیدا.

٣- دانانی پیلان بۆ کوشتن و لەناوبردنی عیسا (عليه السلام) لەلایەن جولەکە بەدڕەفتارە خۆفرۆشەکانەوە ئەو ڕاستیەمان فێردەکات کەجولەکە بەدرێژایی مێژووی پڕ تاوانیان بەردەوام لەهەوڵ دان دابون بۆ سەرکوت کردنی ڕاستی و پاشان دژایەتیکردنی دینی خوای گەورەو کوشتنی پێغەمبەران بەناڕەواو دژایەتیکردنی باوەڕداران پیشەی سەرەکی و هەرەگەورەیان بووە.

٤- ڕزگارکردنی عیساو بەرزکردنەوەی بۆ ئاسمان لەدەست گەلە چەپەڵ و بەدکارەکەی ئەوە دەگەیەنێت کەویستی مرۆڤەکان لەژێر ویستی خوای گەورەدایەو ئەوەی خوای گەورە ویستی لەسەرنەبێت و بڕیار لەسەر (بوون یان نەبوون)ی نەدات ئەوە هەرگیز نابێت و ڕوونادات. بەڵێ گەلە بەدڕەفتارەکەی عیسا (عليه السلام) ویستیان وەهابوو کەعیسا بکوژن و لەناوی بەرن بەڵام بێئاگاو گێل بوون لەوەی کەویستی ئەوان والەژێر ویستی خوای گەورەوەدایە، پەروەردگاریش وای بڕیارداوە کە عیسا (عليه السلام) نەکوژرێت و بەردەستی تاوان باران نەکەوێت. ﴿وما تشاءون إلا ان يشاء الله رب العالمين﴾.

٥- ماتنی ناووی پێغەمبەری ئیسلام (محمد) لە(ئینجیل)دا ڕاستیەکی بەڵگە نەویستەو ئاماژە بۆدرێژەدان بەرەوتی خەبات و هیدایەت و ڕوناکی بەرنامە یەك لەدوایەکەکانی خوای گەورە دەکات بۆ مرۆڤەکان بەدرێژایی مێژوو.

٦- ژیانی عیسا (عليه السلام) ئەو ڕاستیەمان تێدەگەیەنێت کەعیسا بەندەو دروستکراوی خوای گەورەیەو کوڕی خوانیە هەروەك گاورەکان دەڵێن و باوەڕیان وەهایە کەعیسا (خوایە یان کوڕی خوایە). سبحانه وتعالى عما يشركون.

٧- ووتەکانی خوای گەورە کەقورئانی لێپێکهاتووە ئاماژە بۆ ئەو ڕاستیە دەکەن کەعیسا (عليه السلام) لەخاچ نەدراوەو نەکوژراوە هەروەك گاورە خاچ پەرستەکان باوەڕیان وەهایە، بەڵکو عیسا (عليه السلام) بەدەسەڵات و ویستی خوای گەورە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان و ئەوکەسەی کەکوشتیان کەسێکی‌تر بوو کەشێوەی زۆر لەعیسا دەچوو.

٨- دروست بوون و پەیدابوونی دەیان (ئینجیل) بەڵگەن لەسەرئەوەی کەهیچ یەکێ لەو (ئینجیلانە) ڕاست نین و زۆر دوورن لەقسەی خوای گەورەو ڕاستیەکانەوە، بەڵگەشمان لەسەرئەم ڕاستیە ئەوەیە کەخوای گەورە لەسەردەمی خۆیدا تەنها یەك(ئینجیل)ی سپارد بە. عیسا. بەڵام لەپاش خۆی ڕێژەی (ئینجیل)ەکان گەیشتنە (٧٠،٨٠)و بەرەو ژوورترو هەریەك لەو ئینجیلانە جیاوازی و دژایەتی ئاشکرای هەبوو لەگەڵ ئەوی‌تردا، کەئەمەش بەهێزترین بەڵگەیە لەسەردەست کاری‌کردنی (ئینجیل).

٩- دابەزینی عیسا (عليه السلام) لەدواڕۆژدا بۆ سەرزەوی دەیان و سەدان پەندو ئامۆژگاری گەورەی تێدایە کەیەکێك لەوانە بریتیە لەبەدرۆخستنەوەی هەردوو کۆمەڵی (جوولەکەو گاورەکان)!!

بەڵێ بەدرۆخستنەوەی گاورە خاچ پەرستەکانە بەوەی کەباوەڕیان وەهایە عیسا (عليه السلام) لەخاچ دراوە، هەر لەبەر ئەم خاڵە گرنگەیە کەیەکێ لەکارە گەورەو سەرەکیەکانی عیسا لەوکاتەدا بریتی دەبێت لەشکاندنی خاچ. صليب. کەگاورەکان و بەناو شوێن کەوتەکانی عیسا (عليه السلام) بەدروشمی سەرەکی و گەورەی خۆیانی دەزانن.

١٠- نوێژکردنی عیسا (عليه السلام) لەدوای یەکێ لەپیاوچاکانی ئومەتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بەرزی و بەڕێزی و گەورەی ئەم ئومەتە دەردەخات بەسەر ئومەتەکانی پێش خۆیدا.

١١- بەقورئان حوکم کردن لەسەردەمی فەرمان ڕەوای عیسادا (عليه السلام) بەرزی و بڵندی قورئان دەگەیەنێت بەسەر هەموو دین و بیروباوەڕە دەست کردەکانی دنیادا لەگەڵ

ئەمەشدا فشەڵی و بێناوەڕۆکی و هیچ پێنەمانی سەرجەم بیروباوەڕە دەست کردەکانی ژێری سنورداری مرۆڤەکان دەگەیەنێت!!

١٢- مردنی عیسا (عليه السلام) لەدنیاداو ناشتنی لەناو گۆڕدا ئەو ڕاستیە دەگەیەنێت کەمەرجە ئەوەی لەدنیادا لەدایك ببێت ئەوە دەبێت هەر لەدنیادا تێکەڵی خۆڵ ببێتەوە.

داواکاریمان لەخوێنەری بەڕێز:

کۆتا ووتەمان لەخوێنەری بەڕێز بەداواکاریەك دەست پێدەکات کەئەویش بریتیە لە:

((خوێنەری خۆشەویست وەك هەموو ئاگادارن کەوا سەرجەم مرۆڤەکان لەدنیادا دووچاری هەڵە دەبن و بابەت و نوسینەکانیان دەکەوێتە بەرڕەخنەی ڕەخنەگران، گەر هەر لەم ڕوانگەیەوە بڵێین بەحوکمی ئەوەی ئێمەش مرۆڤین ئەوە هەمان یاسا بەسەرماندا جێبەجێدەبێت کەئەویش هەڵەکردنە لەنوسینەکانماندا!!

کەواتە داواکارین لە بەڕێزتان بۆ زیاتر پەرەدان و پێش خستنی ئەم پڕۆژە خێرو خزمەت گوزاریە هەر ڕەخنەیەکتان هەبوو لەبابەتەکان یان شێوازی داڕشتنی سەرباسەکان یان هەرشتێکیتر، ئەوە ئاگادارمان بکەنەوە تائێمەش خۆمانی پێڕاست بکەینەوەو جارێکیتر بەو هەڵەدا نەچینەوە. خوای گەورە پاداشتی چاکەکاران و دڵسۆزان وون ناکات.

هەر بۆ ئەم مەبەستە دەتوانن ڕەخنەکانتان لەشێوەی نوسراوێکداو بەنامە بدەنە دەست کتێبخانەی کەنار لەسەرو مزگەوتی گەورە.

لەکۆتایدا داواکارین لەپەروەردگاری کارجوان کەئەم نوسراوانەمان لێقبوڵ بکات و زیاتر بەردەوامان بکات لەسەر نوسینی ژیانی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزانەی تریش و پاشان بیکاتە توێشەبەرەی ڕۆژی دوایمان و ڕزگارکەرمان لە سزاکانی قەبرو دۆزەخ (ئامین).

تم بحمد الله الغفار المجيب

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه اجمعين

پێنج شەممە ١٧/١٢/١٩٩٨- ٢٨/شعبان/١٤١٩

سلێمانی

((اللهم اجعل عملنا كله صالحا واجعله كله خالصا))

# سەرچاوەکان


١. القران الكريم
٢. تفسير القران العظيم ـ الحافظ ابن كثير
٣. تفسير الكبير ـ فخرالدين الرازي
٤. الجامع لاحكام القران ـ الإمام القرطبي
٥. فى ظلال القران ـ الشهيد سيد قطب
٦. تفسير المراغى ـ أحمد مراغي
٧. تەفسیری قورئانی پیرۆز ـ مامۆستا عوسمان عبدالعزيز محمد
٨. صحيح البخارى ـ الامام البخاري
٩. صحيح المسلم ـ الامام مسلم
١٠. شرح النووى على مسلم ـ الامام النووي
١١. اشراط الساعة ـ يوسف بن عبدالله بن يوسف الوابل
١٢. نظريات فى انجيل برنابا ـ محمد على قطب
١٣. هل الكتاب المقدس كلام الله؟ ـ أحمد ديدات
١٤. مع الانبياء فى القران الكريم ـ عفيف عبدالفتاح طبارة
١٥. قصص الانبياء ـ عبدالوهاب نجار
١٦. قيامة الصغرى وعلامات قيامة الكبرى ـ د. عمر سليمان الاشقر
١٧. النبوة والانبياء ـ محمد على الصابوني
١٨. مع الطب فى القران الكريم ـ د. عبدالحميد دياب
١٩. معالم التوحيد ـ د. مروان ابراهيم القيس
٢٠. مبادئ الاسلام ـ ابو على المودودي
٢١. هموم المسلم المعاصر ـ د. يوسف القرضاوي
٢٢. تأريخ الاسلام (السياسي والديني والثقافي والاجتماعي) ـ د. حسن ابراهيم حسن.

## ناوەڕۆك

| بابەت | لاپەرە |
|---|---|

## بەندی سێهەم



## بەندی چوارەم

## لەم کتێبەدا

بەندی یەکەمی ئەم چیرۆکە دەدوێ دەربارەی عیساو گەلەکەی و پاشان لەدایك بوونی مەریەم وچەند باس و بەسەرهاتێکی تر.

چۆنێتی بانگەوازی عیسا لەناو گەلی بەنی ئیسرائیل دا و موعجیزاتی و مژدەی بۆ گەلەکەی و بەسەرهاتی ئەو سفرە پڕ لە خواردنەی کەلەلایەن هاوەڵەکانی‌یەوە لێی داوا کرا کەلە ئاسمانەوە بۆیان بێتە خوارەوە لەبەندی دووەمی ئەم چیرۆکەدا دەخوێنیتەوە لەگەڵ چەندین باسی جۆراو جۆری تردا .

بەندی سێ‌یەمی ئەم چیرۆکە دەدوێ لە دەربارەی دواسات و دوائامۆژگاری عیسا بۆ گەلەکەی و پاشان دارشتنی پیلان لەدژی عیسا بۆ مەبەستی کوشتن و لەخاچ دان و لەناوبردن و چەند باسێکی تر .

دوا بەندی ئەم چیرۆکە تایبەتە بەدابەزین و هاتنەوە خوارەوەی عیسا لە ڕۆژی دواییدا بۆ سەر زەوی و ئەنجام دانی چەندین کاری گرنگ ، بەدوا پەندو دوا ئامۆژگاری لەسەر جەم ژیانی پڕ سەروەری عیسا (عليه السلام) ئەم چیرۆکە کۆتایی دێت .

لەبڵاوکراوەکانی کتێبخانەی نیشک

ژمارەی سپاردن (٧٣)ی پێ دراوە ساڵی ١٩٩٩ لەلایەن
وەزارەتی ڕۆشنبیری‌یەوە